# ئەرمەن و کورد

فەرهاد پیرباڵ

١–٢

ئێمەی ئەرمەن
هەموو کات بەدڵگەرمییەوە بەتەنگ بانگەوازی کوردەکانەوە چووینە
بۆ ئەوەی هاوکارییان بکەین
کە ئەوانیش سەربەخۆیی خۆیان وەدەست بهێنن.

Bulletin Armenien, N. 18-19-20,
Paris: Mars - Avril 1920.

کوردستان لەو نەخشە جوگرافییانەی لەلایەن کوردناسەکانەوە بڵاو کراونەتەوە، هەردەم کەوتووەتە ناو سنووری سیاسیی دەوڵەتێکی زلهێزەوە (ئیمپراتۆریەتی ئاشووری، ئەرمەنی، هەخامەنشی یان عوسمانی، ساسانی، سەلجووقی، قاجاری..). تەنانەت لە نەخشە جوگرافییە کۆنەکانی سەدەکانی ناوەڕاستیشدا کوردستان زۆر بەدەگمەن وەک وڵاتێکی سەربەخۆ ناوی هاتووە. ئەمەش چونکە کوردستان بەدرێژاییی مێژوو هەردەم بەزۆر لکێندراوەتە دەوڵەتێک یان ئیمپراتۆریەتێکی غەیرە کوردەوە.

کوردستان زۆر نەتەوە و دینی جۆرەوجۆری تێدایە. ئەمە جگە لەوەی کە کورد هاوسنووری نەتەوە و دینی جۆرەوجۆر بووە.. لەوانە ئەرمەن؛ کە لەگەڵیاندا نەک هەر هاوسنوور و دراوسێ بگرە هاوشار و زۆرجاران هاوگەڕەکیش بوونە بەدرێژاییی مێژوو.

گەلی ئەرمەن، لە کۆنەوە دراوسێی کورد، بەشێوەیەکی گشتی لە ڕووی جوگرافییەوە، لە باکوری کوردستانی گەورەدا دەژین: لە ڕۆژئاواوە لە شاری ورمێی کوردستانی ئێرانەوە سنووریان دەست

پێ دەکا تا دەگاتە شاری قۆنیای تورکیا. لە باکوریشەوە: لە ئەرمەنستانی سۆڤیەتییەوە تا خوارووی چیای ئارارات. ئەمە جگە لەوەی لەناو هەندێ لە شارە کوردنشینەکانی کوردستانی تورکیادا لەگەڵ کورددا پێکەوە دەژیان. لەخۆڕایی نییە، لە وڵاتی لبناندا هەتا ئەمڕۆش عەرەبەکان لەبارەی ئەو پێوەندییە پتەوەی نێوان ئەرمەن و کوردەوە دەڵێن «کورد ئامۆزای ئەرمەنییەکانن».

ئەرمەن، بەگوێرەی نووسینی مێژوونووسە یۆنانییەکان (هیرۆدۆت و سترابۆن) دەبێ لە ساڵەکانی ١٢٠٠ بەر لە زاین، لە بەلکانەوە لە ڕێگەی بسفۆر و دەردەنیلەوە بەرەو ڕۆهەڵات هاتبن، بەر لەوانیش ئەو شوێنەی لێی دەگیرسێنەوە دیارە ئۆرارتۆکان (ئیمپراتۆریەتی ئوورارتوو) لە ساڵەکانی دوو هەزاری بەر لە زاین لە دەوروبەری دەریاچەی وان دەوڵەتیان هەبووە کە بە هالدی یا خالدی دەناسران ئیتر ئەوان لەسەر کەلاوەی ئەم دەوڵەتە دادەکوتن.

بۆ ڕەچەڵەکی ئەرمەنەکان، مێژوونووسەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە وەکو کورد لە نەژادی ئەوروپایی و ئارین. دوای بڵاوبوونەوەی ئاینی کریستی، پادشای ئەرمەنەکان یەکەم پادشای دنیا بووە بڕوای بە ئاینی کریستی هێناوە و ئەم ئاینەشی بە فەرمی کردووە بە ئاینی دەوڵەت. ئەوسا کوردەکان زەردەشتی بوون بەڵام هیچ ناکۆکییەکی ئاینی لە نێوانیاندا سەری هەڵنەداوە.

ئەرشاک سافراستیان (کوردستان و کوردەکان، وەرگێڕانی: خالید هەرکی، چاپی یەکەم، هەولێر: ٢٠١٠) دەڵێ: کورد و ئەرمەن، کە دوو نەتەوەی دێرین و ڕەسەنی دراوسێن، بەر لە ٥ هەزار ساڵێک، ئەو کاتەی ئەرمەن لە ناوچەی بەلکانەوە بەرەو چیاکانی ئارارات و زاگرۆس کۆچیان کردووە، دراوسێکانی ئەوسایان کە باو و باپیرانی گەلی کوردی ئێستا بوون، ئەو کات بە گووتی یا کاشوو دواتریش بە میدیا ناو دەبردران، ئەمان ئەو کات لەو ناوچانە دەژیان و خاوەنی خاک و دەسەڵاتی خۆیان بوون ئیتر لەوساوە بوون بە دراوسێی یەکتر، بەڵام دواتر بەرژەوەندییەکان وایان سەپاند کە کورد نەبێتە خاوەن قەوارەی سیاسی و خاکەکەشی بکەوێتە مەترسییەوە.

یەکێک لە کۆنترین بەڵگەنامە کە ئاماژەی بە پێوەندی و دراوسێیەتیی ئەرمەن و کورد دابێت، مێژوونووسی یۆنانی (ئێگزەنەفۆن)ە لە کتێبی (ئاناباز) کە لە ساڵی (٤٠١ پ. ز)دا بە زمانی یۆنانی نووسیویەتی. ئێگزەنەفۆن دەڵێ: «یۆنانییەکان ڕاوەدووی کاردۆخەکانیان نەنا. چوون قسەیان لەگەڵ هەندێکیان کرد، بۆ ئەوەی بزانن ئاخۆ ڕازی دەبن ئەگەر لەشکرەکە بەناو وڵاتەکەیاندا تێپەڕ ببێت؟».

بەم قسەیەی ئێگزەنەفۆن، کاتێ دەڵێ: «چووین قسەمان لەگەڵ یەک دووانێکیان کرد» دەردەکەوێ، کە لەو سەردەمەدا کاردۆخەکان ژیانێکی عەشیرەتگەری و سیاسیی ڕێکوپێکیان نەبووە: هیچ ئاغا یان سەرکردە و پاشایەکیان نەبووە، ئەگینا دەچووە پێشەوە و قسەی لەگەڵ سەرکردەی یۆنانییەکان دەکرد. ئەمە لە کاتێکدا ئێگزەنەفۆن کاتێ باسی ئەرمەنییەکان دەکا، باش ئاماژەی ئەوە دەکا کە ئەو ئەرمەنییانە پاشایەکیان هەبووە و ناوی ئەو پاشایە (تیریباز) بووە.

یئنجا له شوێنێکی تردا دەڵێ: «کریزۆف، خۆی و هاوەڵەکانی له ئاوەکەیان دا. ئینجا ئێگزەنەفۆن، لەلای خۆیەوە، دەستەیەک له پیاوە هەرە چاپووکەکانی هێزی دواوەی هەڵبژارد و له دواوەڕا، به هەموو هێزی خۆیانەوە، به ڕاکردن ملیان نا بەرەو گوزەرگاکەی بەرامبەر ئەو ڕێگەیەی دەچووەوە سەر زنجیرە چیای ئەرمەنییەکان..».

پاشان له بەشی چوارەمدا دەڵێ: «یۆنانییەکان ڕووبارەکەیان بڕی؛ دەستە دەستە له شێوەی تەدارەکی سەربازیدا، دەمەونیوەڕۆ گەیشتنە سەر خاکی ئەرمینیا، دەشتێکی هەتا چاو هەتەر دەکا بەرفراوان، جارجار نەبێ که هەورازێکی دەهاتە بەرمانەوە. بەڵام ئەو ناوە، نێزیک ڕووبارەکە، سەبارەت به ناکۆکی و دووبەرەکایەتییان لەگەڵ کاردۆخەکان، هیچ گوندێکی لێ نەبوو».

له ساڵی (٤٠١ پ. ز)دا گەزنەفۆن له پەڕتووکەکەیدا بەناوی (کورووشنامە) ئاماژەی بەوە کردووە که ئەرمینیا له سەردەمی ئیمپراتۆریەتی میدی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو بەڵام سەر بەدەوڵەتی میدیا بووە. هەروەها ماسا خورینی مێژوونووسی ئەرمەن دەڵێ: «ئێمە له سەردەمی هایکدا نازناوی پادشامان نەبوو میرمان بەکار دەهێنا بەڵام ئەم نازناوە ئەرباکس پادشای میدییەکان بەئێمەی دا، ئەو کاتەی میری ئەرمەنییەکان (باروێرە)ی نازناوی پادشای پێ دا و کرایە پادشای ئێمە».

لەناو گەڕاڵە ئەوروپاییەکانی سەدەی سێزدەم، مارکۆ پۆڵۆ له سەفەرنامەکەی خۆیدا له بەشی (٢١: ل ٦٩) ئاوها باسی پێوەندیی نێوان ئەرمەنستان و کوردستان دەکا:

له مەڵبەندی تورکمان Turcomanدا سێ جۆر خەڵک دەژین: تورکمان، که محەمەد دەپەرستن و وەکو ئاژەڵان دەژین. له هەموو شتێکدا میللەتێکی نەزان و جاهیلن، زمانێکی وەحشییانەیان هەیە و له زمانی میللەتانی تر ناچێ. ماڵیان نییە، لەناو شاخ و داخان لەگەڵ ئاژەڵەکانیان دەژین و کۆچەرن. خەڵکی تر: ئەرمەنییەکانن، که خەڵکانێکی مەسیحیی زۆر ڕێکوپێک، پاشانیش یۆنانییەکان که هەردووکیان تێکەڵ لەناو شار و دێهاتەکان ژیان بەسەردەبەن. خەریکی بازرگانی و پیشەی جۆرەوجۆرن. ناودارترین شارەکانی ئەم مەڵبەندە ئەمانەن: قۆنیا، قەیسەری، سیڤاس. سانت بلاسیۆس له ساڵی ٣١٦دا له سیڤاس شەهید کرا له پێناو مەسیح. ئەم سێ شارە زۆر دەوڵەمەند و ئاوەدانن.

ئنجا له بەشی (٢٢: ل ٧٠– ٧٣) دەڵێ:

«ئەرمینیای گەورە مەڵبەندێکی یەکجار فراوانە. له هەموو شوێنێکدا هەمان زمان بەکار دەبەن و له زمانی مەڵبەندەکانی تر جیاوازە. بەشێوەیەکی گشتیش دەچێتەوە سەر زمانی ئەرمینیای بچووک. له ئەرزنجانەوە دەست پێ دەکا. بەشی هەرە زۆری خەڵکەکە ئەرمەنین. شارەکانی تریش برێتین له ئەرزەڕۆم Argiron، ئەرجیش، بایبوورت که دەکەوێتە سەر ڕێگەی ترابزۆن بەرەو تەورێز.

لەم مەڵبەندەی ئەرمینیای گەورەدایە که کەشتییەکەی نوح، وەک بیستوتانە، لەسەر

لووتکەی چیایەکی یەکجار بەرز گیرساوەتەوە».

ئینجا دێتە سەر باسی ئەرمەنستان و دەڵێ:

«ئێستاش با وەسفی سنوورەکانی ئەم ئەرمینیا گەورەیە بکەین. باشووری، ئەمانەن: مووسڵ، مووش، ماردین. خەڵکی مووسڵ مەسیحین: ژاکۆبی Jacobites و نەستۆرین Nestoriens».

بازرگانی ناوداری فەرەنسایی، ژان باپتیست تاڤێرنیێ J.B. TAVERNIRER لە سەفەرنامەکەیدا Les Six Voyages en Turquie et en perse کە لە ئەمستردام بە فەرەنسایی لە (١٦٧٨) چاپ کراوە، لە بەرگی دووەم لە لاپەڕە ٢٦دا باسی ئەوە دەکا کە لەشکرە فراوانەکەی شا عەباسی سەفەوی لە چەندان میللەتی جۆرەوجۆر پێکهاتوون، وەکو «عەرەب ـ ئەرمەن، فارس، کورد... هتد»؛ ئینجا باسی ئەرمەن و کوردەکانی شاری دیاربەکر دەکا، دەڵێ:

«شارەکە شارێکی ئاپوورەیە و ژمارەی دانیشتوانی گەلێک زۆرە. خەڵک دەڵێن کە تەنیا مەسیحییەکان ژمارەیان دەگاتە زیاتر لە بیست هەزار کەس. دوو لەسەر سێی ئەو مەسیحییانە ئەرمەنن، ئەوانی تریش نەستۆری و کەمێکیشیان یاقووبین».

لەناو گەراڵە فرەنساییەکای کۆتاییی سەدەی هەژدەمدا، پییێر ژووبێرت Pierre-Amedee JAU-BERT ، لە سەفەرنامەکەی خۆیدا، بە فراوانی باسی پێوەندیی نێوان کورد و ئەرمەن، هەروەها لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی فارس و عوسمانی دەکا، هەروەها ژیانی کورد و ئەو ئەزموونە زەحمەتەی کە لای کوردەکان چەشتی. ناوبراو لە ساڵی ١٨٢١دا لە پاریس کتێبێکی بایەخدار لەبارەی کوردستانەوە بەناونیشانی Voyage en Armenie et en Perse بڵاو دەکاتەوە.

ئەم چەند دێرەی لە خوارەوە دەیانخوێنینەوە بریتین لە بیر و بۆچوونی رۆژهەڵاتناسێکی فرەنسایی بە ناوی (ئەلفرێد ژاکوب) کە لە چارەگی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا سەفەرێکی دوور و درێژی بەپارزەوینی ئەفریقدا و ئاسیادا کردووە: لەو سەفەرەیدا سەری لە کوردستانیش داوە و یاداشتەکانی خۆی لە کتێبێکدا بەناونیشانی Voyages en Asie en Afriqne لە ساڵی ١٨٥٣دا لە پاریس چاپ کردووە. لە بەشی سی و نۆیەمی گەشتنامەکەیدا لە لاپەڕە ٢٨٩دا، دوای باسی شاری یەریڤان و چیای ئارارات و ڕووباری ئاراس، لە دەستپێکردنی شاری (وان)دا دەڵێ:

« شاری وان دەکەوێتە رۆژهەڵاتی گۆمی وانەوە، هەر چوار دەوری بە شوورەیەکی بەردین دەور دراوە، لە ناوەوەشدا قەڵایەکی بەرز کە لەسەر کەڵەبەردێکی تاق و تەنیا هەڵچندراو، پارێزگاریی شارەکە دەکا. شاری وان نێزیکەی (٢٠,٠٠٠) بیست هەزار کەسی تێدا دەژی، بەشی زۆریان ئەرمەنین، شاری وان بەکۆنترین شاری ئەرمینیا لە قەڵەم دەدرێ، هەر بۆیەش لە ڕووی مێژووییەوە بەختی ئەوەی هەبووە کە هەموو کات گەڕیدەکان رووی تێ بکەن».

پاشان باسی شاری ئەرزەڕۆم دەکات: «گرینگترین شاری ئەرمینیای تورکیا لە ڕووی بازرگانی

و ژمارەی دانیشتوانەوە بریتیە لە شاری ئەرزەرۆم، ئەو شارەی کە بەم دواییە ژمارەیەکی زۆر لە فرەنساییەکان روویان تێ کردبوو. شاری ئەرزەرۆم ئەمرۆ بریتییە لە ناوەندێکی زۆر گرینگی پاشایەتی کە سەرتاپای بەرزاییەکانی ئەرمینیا دەگرێتەوە؛ تورکەکان بەم ناوچەیە دەڵێن کوردستان».

ئینجا لە لاپەڕە ۲۹۲دا لە باسی یەزیدییەکاندا دەڵێ: «ئەرمینیا جگە لە خەڵکی تورک و دوورەگ، ژمارەیەکی سەرنجڕاکێشی لە یەزیدییەکانیش تێدا دەژی، یەزیدییەکان ئەو کۆمەڵە خەڵکەن Peu-plades کە لە سەرتاپای میزۆپۆتامیای کۆندا، دەژین، هەروەها لە سووریا، لە حەلەبەوە تا بەسرە، لە مووسڵ، لە تەوریز، لە یەریڤان».

کوردناسێکی تری فرەنسایی، هینری بیندەر Henry BINDER، لە کتێبی Au Kurdistan کە لە (۱۸۸۷) لە پاریس چاپ کراوە، لەبارەی چالاکی و ڕۆڵی ئابێ مەسیحییەکانەوە لە شاری مووسڵدا دەڵێ:

«بنکە دینییەکان ڕۆژ بەڕۆژ فراوانتر دەبن، ساڵ بەساڵیش ژمارەی ئەوانەی پێوەندی بە مەزهەبی ئەوانەوە دەکەن، زۆرتر دەبن. ئابێ کان هەرگیز داوا لە موسڵمانەکان ناکەن بچنە سەر دینی ئەوان.

سەردانی خوێندنگە و چاپخانەکەیان دەکەین کە زۆر بەجوانی دامەزراوە. لە چاپخانەکەی خۆیاندا، کتێبی دینی بە زمانی ئەرمەنی و ئیسترانقیلی و کلدانی و سوریانی و عەرەبی چاپ دەکەن. فەرمانبەر و کرێکارەکانی چاپخانە ئەو گەنجانەن کە لە بەردەستی باوکە رۆحانییەکان پەروەردە بوونە.

هاوسنووری و پێکەوەژیانی ئەرمەن و کورد، تەنانەت لە گەلێک گوند و شارۆکە و شارەکاندا هەردووکیان هەر لەناو هەمان گوند و شاردا پێکەوە ژیاون، وایکردووە دۆستایەتی و خۆشەویستی و لە یەکترچوونێک لە نێوانیاندا پەیدا ببێ؛ تەنانەت وای کردووە هاوچارەنووس پێکەوەش ڕووبەڕووی ترشی و تاڵیی ژیان و داهاتووی خۆیان ببنەوە: بەتایبەت بەدەست زوڵمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و سەفەوی و قاجارییەکانەوە.

پێوەندیی نێوان کورد و ئەرمەن تەنیا دراوسێیەتی نەبووە، بگرە نێزیکایەتییەکی کۆمەلایەتی و کولتووری لە نێوانیاندا هەر لە کۆنەوە هەبووە: لە بەشەکانی کوردستانی تورکیا و ئێرانیشدا.

د. جەمال نەبەز ئاماژەی ئەوە دەکا کە پێش هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان، بەشێک لە نووسینە کوردییەکان بە خەتی سریانی بوونە، بەشێکی کەمتریشیان بە خەتی ئەرمەنی بوونە. ڕاستییەکەیشی، ئەرمەنییەکان لە سەدەکانی ڕابردوودا ڕۆڵی زۆریان هەبووە بەسەر بووژاندنەوەی کولتووری کورددا.

لە فــۆلکلۆری کــوردیدا هـەندێ ســـەرچاوە بـاس لەوە دەکــەن کــە لە ســـەردەمـی ساسـانییـەکـاندا، (شـیـرین)ی دەزگـیـرانی فـەرهادی کـۆکـەن ئەرمـەن بووە؛ کـچی پاشـایەکی ئەرمـەن بووە. بەڵام (حەمـەبۆر) لێکدەرەوەی دیوانی (کوردی)، لە چاپەکەی دەزگای ئاراسدا پێی وایە شیرینی کچە ئەرمەن ژنی پاشایەکی ساسانی بووە بەناوی کەیخـوسرەوی پەروێز، لەم بارەوە دەڵێ: «شـیرین: کە ژنی خـوسرەو پەروێز بووە، کـچە ئەرمـەنییـەک بووە، بـەناوی (سـیـرۆن)ەوە کـە بەیتی شـیـرین و فـەرهادیش بەزمـانی ئەرمــەنی هـەیـە. گـوایـە خـوسـرەوی مـێـردی مـەرجی ئـەو هونەرنواندنەی فـەرهادی کۆهـکەنی کردووە کـە بەرامـبـەر بەوە واز لە (شـیـرین)ی ژنی بهـێنێ بۆ (کـۆهـکەن) و بڕوای وا بـووە، کـۆهـکەن ئەو کـارەی بۆ ناکـرێ کـاتێ زانیـویە ئـەوا (کـۆهـکەن) زۆر بەجـوانی و چاکی و هونەرمـەندانە کارەکـەی لە کۆتاییدایە، خوسـرەو لە بەڵێنـەکەی پەشیمـان دەبێتەوە هانای بۆ پیرێژنێک بردووە کە چۆن لە دەست کۆهکەن ڕزگار ببێ، ئەو پیرێژنە لە داوێنی چیـایەکەوە دەکەوێتـە شیوەن و هاوار و گریان و کە (کۆهـکەن) هۆی ئەو (شەپۆڕ)ەی لێ پرسـیوە، پیرێژن وتوویە شیرین مردووە، ئیتر کۆهکەن گورج قوڵنگێکی بەردتاشـیی لە ناوچەوانی خۆی داوە و لە چیـایەکەوە بەربووەتـە خـوارێ و بەناکامی مردووە».

ئەرمـەنیبوونی شـیرین، کە لە زمـانی ئەرمـەنیدا بە (سـیـرۆن) ناودەبرێت، لە هـەمـوو ڕوویەکەوە، نیشانەی پێوەندیی بەهێزی نێوان ئەرمەن و کورد بووە لەو زەمانەوە. بەتایبـەتیش چونکە (شیرین) نەک هـەر سـیـمـبولی خـۆشـەویسـتی و جـوانیی کـچـە، بگرە ڕیشـەی خـۆی زۆر جوان لەنـاو شیـعری کـلاسیـکیی کوردیدا ڕەگاژۆ کـردووە، تەنانەت لەناو زمـانی کوردیشـدا: شـیـرین زەمـانە، شـیـرین زمان، شیرین خەو...

عـەلادین سـەجـادی لـە (ڕشـتـەی مـرواری)دا دەڵێ کـە پیرێژنێکی خـەڵکی سـولەیمانی ئەمـانەی دەوت:

| | |
|---|---|
| چوومەماڵـی گاوەر | قوڵپەقوڵپی ساوەر |
| چوومە ماڵـی جوولەکە | قوڵپە قوڵپی کوولەکە |
| چوومە ماڵی ئەرمەنی | قوڵپەقوڵپی سەمەنی |
| چوومە ماڵی موسڵمان | دەنگی ئایەت و قورعان!. |

خۆشەویستی و پێوەندیی نێوان ئەرمەن و کورد گەیشتووەتە ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە خودی زانا ئەرمەنییەکان لەبارەی مێژووی کوردەوە نووسیویانە.

مــێــژوونووســـی گــەورەی ئەرمــەنی، مــایســـــــای خـۆرێنسـکی Moses Khoren، لە ســەدەی پێنجەمدا، بە سـەرچاوەیەکی گرینگ دەژمێردرێت لە بواری مێژووی دێرینی کورددا. مینۆرسکی لە لێکۆڵینەوەکـانیدا، لەبارەی مێدێکان و کوردەوە، کەڵکی لە کتێبـەکانی ئەم مێژوونووسـە ئەرمەنییە

وەرگرتووە کە لێکۆڵینەوەکانی لەبارەی مێدەکانەوە نووسیوە و دەسنووسەکانی لە ماتێنەدەرانی ئەرمەنستاندا پارێزراون. بەرهەمی ئەم مێژوونووسە، هەرچەند باسی مێژووی دێرینی کورد دەکا، بەڵام پێوەندیی بە ناسینی کورد و سەرەتای پێکهاتنی کوردناسییەوە هەیە. کتێبەکەی کراوەتە فرەنسایی و لە ١٨٤١دا لە ئیتاڵیا چاپ کراوە.

بۆ کورتکردنەوەی باسەکەمان، هەروەها بە پشتبەستن بە (کورد و ئەرمەن، پێوەندییە مێژووییەکان، نووسراوی فارس عوسمان، وەرگێڕانی خالید هەرکی، بڵاوکراوەکانی نما)، ئەو پێوەندییەی نێوان ئەرمەن و کورد بەشێوەیەکی کرۆنۆلۆجی دەخەینە بەرچاو. زۆربەی ئەم زانیارییانەی ئێرە، لە سەرچاوە فرەنساییەکانەوە و لەو کتێبانەی خۆمەوە کە پێشتر چاپم کردبوون، وەرگیراون:

٦١٢ پ. ز

دەوڵەتی ئۆرارتۆ، کە لە ساڵانی (٨٠٠ پ. ز)ەوە دامەزرابوو، بەردەوام دەبێ تا ساڵی (٦٠٩ – ٦١٢ پ.ز) واتە تا ئەو کاتەی لەسەر دەستی میدییەکان کۆتایی پێ دێ. ئەم لەناوچوونە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەرمەنەکان بۆ گردۆلکەکانی ئەرمینیا کۆچ بکەن و لەوێ نیشتەجێ بن دواتر دەوڵەتی ئەرمینیای یەکەم دابمەزرێنن.

هەرچەندە کورد و ئەرمەن بەشدارن لە پێکهێنانی (ئوورارتۆ) کە هەردوو گەل لەسەر ئەوە کۆکن کە لە بنەڕەتدا دەچنەوە سەر ئەم ڕەگەزە بەڵام پێوەندییە ڕاستەوخۆکانیان بۆ ئەوکاتە دەگەڕێتەوە کە دەوڵەتی میدییەکان بە هاوپەیمانی لەگەڵ دەوڵەتی کلدانییەکان (بابلی) توانییان ئیمپراتۆریەتی ئاشووری لە ٦١٢ پ.ز بڕووخێنن و سامانەکەشی لە نێوان خۆیاندا دابەش کەن، ئەو کات ئیتر ناوچەی ئەرمەنەکان دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی میرە ئەرمەنییە خۆجێیەکان کە لەژێر دەسەڵاتی ناڕاستەوخۆی میدییەکان دەبردرا بەڕێوە، ئەو کات حاکمەکان لە خەڵکی ناوچەکە و لە ئەرمەنەکان بۆیان دادەمەزراندن بەمەرجی ئەوەی دڵسۆزی و لایەنگرییان بۆ سیاسەتی دەوڵەتی میدییەکان هەبێ، سەرانە و باجی دارایی و سەربازیش بە دەوڵەتی میدییەکان بدەن.

٥٥٠ پ. ز

دوای ئەوەی داریووش پاشای هەخامەنشی (ئەخمینی) دەوڵەتی میدییەکان لەناودەبات و ئیمپراتۆریەتی ئەخمینییەکان دادەمەزرێنێ، ئەرمینیا دەبێتە هەرێمی سێزدەمین لە ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی. کورووشی هەخامەنشی (ئەخمینی) کوڕێکی خۆی دەکاتە حاکمی ئەرمینیا و میدیا و مەملکەتی کادوسین. بەم شێوەیە کورد و ئەرمەن کەوتنەوە ژێر دەستی یەک فەرمانڕەوا. ئەمە بووە مایەی ئەوەی کە هەردووکیان (کورد و ئەرمەن) پێوەندییەکانیان خۆش بکەن لە پێناو دژایەتی و بەرگریکردن لە دەسەڵاتی ئەخمینیی زاڵ و نوێدا. ئەوە بوو ئەرمەنەکان پشتگیرییان لە شۆڕشی (فرۆرتیش)ی میدیایی کرد دژی داریووشی یەکەم.

٣٣١ پ. ز

ئەسکەندەری مەقەدۆنی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی لە ساڵی (٣٣١ پ.ز) لەناو دەبا؛ ئەرمینیا دەچێتە ژێر دەسەڵاتی یۆنانی.

یەکەم دەوڵەتی سەربەخۆی ئەرمەنی لە ماوەی ٣٣١ تا ١٨٩ پ..ز دادەمەزرێ کە بە میرنشینی ئەرمەنیی یەکەم دەناسرێ.

لە ئەنجامی مردنی ئەسکەندەر لە ٣٢٣ پ.ز دابەشبوونی ئیمپراتۆریەتەکەی، هەریەک لە (میدیا – وڵاتی کوروئین – کوردستان) و ئەرمینیا بوونە بەشی فەرماندەکەی کە ناوی سلوقس بوو. ناوچە کوردی و ئەرمەنییەکان خەڵکانی ناوچەکە خۆیان حوکمڕانیان دەکردن.

لە کۆتاییی سەدەی دووەم و سەرەتای سەدەی یەکەمی (پ.ز)دا، ئەرمینیا و کوردستان دەبنە سەنتەری ململانێکانی نێوان ئیمپراتۆریەتی برپی و رۆمانی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هێزێکی نوێ لە ناوچەکە سەر هەڵبدات ئەویش شانشینی ئەرمەنی بوو – دووەم شانشینی ئەرمەنی لە ١٨٩پ.ز – کە بە هاوکاریی پادشای برپیی میهردادی یەکەم توانیی یەکەم جار باکوری کوردستان داگیر بکا و دواتریش باشووری کوردستان.

ئەو کات تیگران پادشای دووەم پایەتەختێکی نوێ دروست دەکا بەناوی تیگران کیرتا (میافارقینی ئێستا) لە لێواری چەپی رووباری دیجلەی نێزیک دیاربەکر.

١٤٠– ٥٥ پ. ز

مێژوونووسی ئەرمەنی مووسا خورینی کە لە سەدەی پێنج و سەرەتاکانی سەدەی شەشدا ژیاوە، ئاماژە بەوە دەکات کە (مار) واتە میدییەکان لە دەوروبەری رووباری ئاراکس لە سەردەمی تیگران پادشای مەزن لە ١٤٠– ٥٥ پ.ز بوونیان هەبووە، ناوبراو ئەو ناوچانەی دەستنیشان کردووە کە کوردەکان لێی ژیاون، زۆر بە ڕوونی دەڵێ ئەو کەسانە (مەبەستی کوردە) لە رۆهەڵاتی چیای ئارارات دەژیان؛ هەندێکیشیان لە کەنار رووباری ئاراس بوون، بەشی سێیەمیشیان لە ناوچەی سەروکانیی رووباری کارنی دەژیان کە لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا پێی دەوترێ رووباری کورد، لە تەنیشت (دوین)ی پایەتەختی ئەرمینیای کۆن.

٩٤– ٥٥ پ. ز

لە بەناوبانگترین پادشاکانی میرنشینی ئەرمەنیی دووەم (تیگرانی دووەم) بوو کە بە «تیکرانی مەزن» دەناسرا، لە ساڵی ٩٤ – ٥٥ پ.ز حوکمڕانیی کرد. ئەم پادشایە توانیی هەموو ئەرمینیا رزگار بکا. ئەوە بوو خوارووی وڵاتی نێوان دوو رووبارەکە (مابین النهرین)ی بە ئەرمینیاوە لکاند تا گەیشتە سوور و سەیدا لە سووریا. دوای ئەوە کاپەدۆکسی لە ئاسیای بچووک داگیر کرد تا وای لێ هات لە ساڵی ٧٠ ی پ.ز بووە یەکەم حاکمی ناوچەی ڕۆهەلات، بەهۆیەوە کۆنسۆلی

ڕۆمانی (شیشرۆن) ناوی نابوو (پادشای ئاسیای مەزن) چونکە سنووری ئیمپراتۆریەکەی لە ڕۆهەڵاتەوە: لە دەریای قەزوینەوە تا دەریای سپیی ناوەڕاست، لە ڕۆئاوا و لە باکوریشەوە قەوقاس تا کیلیکیا و فەلەستین لە باشوور دەگرتە خۆ.

٤٢٩ ز.

بە مردنی چوارەم ئەردەشێر پادشا، لە ٤٢٩ز ئەرمینیا ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ساسانییەکانەوە تا ساڵی ٦٤٠ ئەو کاتەی لە سەردەمی عومەر کوڕی خەتاب سوپای عەرەبی بە سەرکردایەتیی (عیاض بن غنم) دەگاتە ئەوێ.

٦٤٢

سەرکردەی عەرەب (سوراقە بن عەمرو) دەگاتە دەریای قەزوین، دوای زیاتر لە دە ساڵێک، واتە لە ٦٥٣ پەیمانێکی ئاشتەوایی لە نێوان ئەو و حاکمی ئەرمەنیی سەر بە دەوڵەتی ساسانییەکان دەبەسترێ بەو مەرجەی والییەکی عەرەب بۆ ئەرمینیا دابمەزرێ و یاریدەرەکەشی ئەرمەنیی خەڵکی ناوچەکە بێ.

ئەم دۆخە بەم شێوەیە بەردەوام دەبێ تا ئەو کاتەی (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) خەلافەتی ئەمەوییەکان دەگرێتە دەست لە ساڵی ٦٦١ کە (بانگخوازی ئەرمەنییەکانی کرد بۆ ئەوەی سەرانە بدەن و گوێڕایەڵی ئەو بن) ئەرمەنەکان زاتی ئەوەیان نەکرد ئەم بانگخوازە ڕەت کەنەوە بۆیە حاکمی ئەرمینیای ئەو سەردەم (گریگۆر مامیگۆنیا) سەردانی دیمەشقی کرد و معاویەش زۆر بەڕێزەوە پێشوازیی لێ کرد بەم شێوەیە پێوەندییەکانی عەرەب و ئەرمەنی لە سەردەمی معاویە بە خۆشی بەڕێ دەچن.

٦٥٧

پاش ئەوەی هاوپەیمانێتیەکەی نێوان ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی و دەوڵەتە عەرەبە موسڵمانەکان لە ٦٥٣ کۆتاییی دێ، میر تیۆدۆر ئەرمینیا ڕادەستی عەرەبەکان دەکاتەوە، عەرەبەکان بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان ئەبی سوفیان و عەلی کوڕی ئەبی تالیب لە ٦٥٧ ناچار دەبن لەو وڵاتە بکشێنەوە، ئەمە لەوکاتەدا دەبێ کە ئەبی سوفیان ناچار دەبێ سوپاکەی لە ئەرمینیا بکێشێتەوە ئیتر ئەرمینیا دووبارە دەکەوێتەوە ژێر دەسەڵاتی بێزەنتییەکان.

٨٤٩

پێوەندییەکانی ئەرمەن و عەرەب لە سەردەمی هەردوو دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسیدا بە چەند قۆناغێکی ناجێگیرلە نێوان ئاشتی و شەڕدا تێپەڕ دەبێ. هەندێک جار گەیشتووەتە ئاستی شۆڕش هەڵگیرسان و یاخیبوون.

شۆڕشی ئەرمەنییەکان کە لە ساڵی ٨٤٩ هەڵگیرسا لە ٨٥٢ دامرکایەوە، ئەمەش بە ترسناکترین شۆڕشی دژی دەوڵەتی عەباسی دێتە ئەژمار کە لە سەردەمی حوکمڕانی متوکل هەڵگیرسابێ. دوای ئەوەی بەسەر شۆڕشەکەدا زاڵ دەبن خەلیفەی عەباسی متوکل، سەرکردەی ئەرمەنی (ئەشوەت) دەکا بە حاکمی ئەرمینیا، کە زۆر بە توانایی تا ٨٨٥ حوکمڕانییەکەی دەبرد بەڕێوە و هەموو میرە ئەرمەنییەکانیشی ناچار کرد تا داوا لە خەلیفەی عەباسی بکەن بۆ ئەوەی ئەشوەت بکا بە پادشای ئەرمینیا. ئەوە بوو خەلیفەی عەباسییش گوێی بۆ داواکەیان راگرت.

ئیتر لەو رۆژەوە لە ٨٨٥ میرنشینی چوارەمی ئەرمەنییەکان دامەزرا، ئەشوەت پادشا هەموو هەوڵەکانی خستنە گەڕ بۆ ئەوەی لە ململانێکەی نێوان عەرەب و بێزەنتیەکان بێلایەن بوەستێ.

لە سەردەمی ئیسلامدا کە زۆربەی کورد بڕوایان بە ئاینی ئیسلام هێنا.. ئەرمەنەکانیش لەسەر ئاینی کریستی خۆیان مابوونەوە.

کورد و ئەرمەن بەیەکەوە ڕووبەڕووی هێرشەکانی تورک و تەتەر و مەگۆلەکان بوونەتەوە، بەیەکەوە تووشیان بە تووشی کاولکار و خاپوورکاران بووە. ئەوەی هاتە سەر کوردستان لە کوشتن و بڕین و کاولکاری هاتووەتە سەر ئەرمینیاش، ئەمە بووەتە مایەی ئەوەی کە هەردووکیان ببنە خاوەنی یەک چارەنووس و یەک هەست.

٨٥٠ – ٩٥٠

محەمەدی مەلا کەریم لە کتێبی حاجی قادری کۆییدا دەڵێ:

هەر لە سەرەتای هاتنی عەرەبە موسڵمانەکانەوە لە سەردەمی خەلیفەی دووەم عومەر و خەلیفەی سێیەم عوسماندا زۆر شوێنیان لە باشووری ئەرمینیا داگیر کردووە و ئیتر وردە وردە بەشی هەرە زۆری خەڵکی ئەو شوێنە داگیرکراوانە، بەزۆر یا بەخواهیش، موسڵمان بوون و، بەپێی ئەوە کە کوردی موسڵمان دراوسێیان بوون و موسڵمان بوون، بە موسڵمانبوونەکەیان لە گەلەکەی خۆیان دابڕاون و زمانی کوردی بووە بە زمانیان و بوون بە کورد.

هەر میرێکی کورد لە یەکێ لە میرنشینییە دراوسێکانیاندا دەسەڵاتی بووبێ لێی داگیر کردوون و خەڵکی ئەو شوێنە تازە داگیرکراوانەیش هەروا وردە وردە موسڵمان بوون. پاشتریش کە خێڵە تورکەکان لە ئاسیای ناوەڕاستەوە بەئێران و عێراقی ئێستادا هاتن و تورکیای ئێستایان داگیرکرد کە گەلێ میللەتی جوێ جوێی تێدا بووە و، ئەرمەنیش یەکێک بووە لە گەلەکانی ڕۆژهەڵات و باکوری ڕۆژهەڵاتی و، بەشێکی زۆری باکوری کوردستانی ئێستایش بەشێک بووە لە ئەرمینیا، عەشایرێکی شەڕوانی زۆری کوردیش لەگەڵ خێڵە تورکەکاندا هاتوون و لەوانەیە لە پێشیشیانەوە بووبن و شەڕیان بۆ کردبن و وڵاتیان بۆ داگیر کردبن. خێڵە کوردەکان ڕۆژهەڵاتی تورکیای ئێستایان داگیر کرد کە بەشێک بووە لە ئەرمینیا و خێڵە تورکەکانیش ناوەڕاست و ڕۆئاوای و، هەردوولا بەدرێژاییی ساڵان بەشێکی زۆری میللەتی ئەرمەن و ڕۆم و گەلانی تری تورکیای ئەو

سەردەمەیان کرد بەموسڵمان و ئەوانەی لەژێر دەستی کوردەکاندا موسڵمان بوون بوون بەکورد و ئەوانەی لەژێر دەستی تورکەکاندا موسڵمان بوون، بوون بە تورک، وەک چۆن یۆنانییەکانی قوبرس کە عوسمانییەکان داگیریان کرد ئەوانەیان کە موسڵمان بوون، بوون بە تورک و ئەوانەیان لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە هەر بە یۆنانییەتی مانەوە و، ئەو بەشانەیش لە گەلانی بەڵقان کە لەژێر دەستی عوسمانییەکاندا موسڵمان بوون لە گەلەکانی خۆیان دابڕان و زۆریشیان بوون بە تورک.

لەو کاتەوە کە بەشێکی زۆری ئەرمەنستانی لەوەوپێش بووە بە کوردستان، نەتەوەییەکانی ئەرمەن ئەو ناوچانە، هەروەک جاری جاران، بەئەرمینیا دادەنێن، وەک چۆن هەندێ نەتەوەیی عەرەب گۆرانی بە بالاّی ئەندەلووسی جاراندا دەڵێن.

٩٥١

دەوڵەتی شەدادی لە ساڵی ٩٥١ لەسەر دەستی محەمەد کوڕی شەداد کوڕی قرتق دروست بوو سەرەتا شاری کنجە (جنزە)ی کردە پایەتەخت کە دەکەوێتە خوارووی شاری یەریڤانی ئێستا بە ٢٥ کم (بۆ دامەزراندنی دەوڵەتەکەی کوردەکانی نیشتەجێی ئەوێ هاوکاریی زۆریان کرد) دواتر پایەتەختەکەی لە کنجەوە گواستەوە بۆ پایەتەختی ئەرمەنەکان (دوین).

وا مەزەندە دەکرێ کە شاری جنزە یا کنجە هەمان شاری دوین بێ کە ئەیووبی باوکی سەلاحەدین لەگەڵ خانەوادەکەی لێی ژیاوە ئەو کاتەی لە سەردەمی شەدادییەکان رووی تێ کردووە. ئەم شارە پایتەختی کۆنی ئەرمەنەکان بوو بەڵام دواتر شەدادییەکان کردیانە پایەتەختی دەوڵەتی کوردیی ئیسلامی. ئەمە بەر لەوەی بۆ پایەتەختەکەی تری خۆیان بچن کە (ئانی) بوو.

٩٩٠

دەوڵەتی دووەمی کوردی کە کاریگەری ئەرێنیی هەبووە لەسەر پێوەندییەکانی کورد و ئەرمەن دەوڵەتی دۆستەکی بوو، کە لە هەندێک سەرچاوەی عەرەبی بە دەوڵەتی مەروانی ناوی دێت. ئەم دەوڵەتە، میری کورد باز کوڕی دۆستەک لە ٩٩٠ دایمەزراندووە، شاری میافارقینی کردە پایەتەخت. ئەمەش دیارە کە یەکێکە لە پایەتەختەکانی ئەرمەن کە پادشای ئەرمەنی تیگرانی مەزن دروستی کردبوو ناوی نابوو (تیکرانا کیرتا).

١٠٧١

لە شەڕی (مەلازگر) کە تیایدا بە سەرۆکایەتیی (ئەلب ئەرسەلان) بەسەر ئیمپراتۆری بێزەنتیەکان (چوارەم رۆمانوس) سەردەکەوێ؛ سەلجوقییەکان شاری (ئانی) و دواتر (قارس)یان داگیر کرد. ئەو کات هەموو وڵاتی ئەرمینیای بێزەنتی دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکان.

١١٨٧

کۆنترین میناتۆری کوردی: فرمانێکی سەلاحەدینی ئەیوبیی تێدایە کە ئازادیی ئەرمەنییەکان لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتەکەی خۆیدا مسۆگەر دەکات؛ داوا دەکات کە ئەرمەن بۆیان هەیە کولتووری نەتەوەییی خۆیان هەبێت و ئازادانە بە زمانی خۆیان بنووسن.

ئەم هەڵوێستەی سەلاحەدینی ئەیوبیی کورد لە هەمبەر ئەرمەنییەکان، بە یەکەمین هەڵوێستی ئیسلام دەژمێردرێ کە بەشێوەیەکی فەرمی، بێ وەرگرتنی باج، ڕێگەی دابێتە گەلێکی مەسیحی کە بەشێوەیەکی ئازاد کولتوور و زمانی خۆیان بەکار بهێنن.

١٧١١

پەندی کوردی بە ئەلفابێی ئەرمەنی.

د. کەمال مەزهەر، لەبارەی دەسنووسی کوردی بە ئەلفابێی ئەرمەنییەکانی ئارشیڤخانەی شاری ماتێنەدەرانەوە لە ئەرمەنستانی سۆڤیەتدا دەڵێ کە لەوێدا " ئینجێلێکی دەسنووس بە زمانی کوردی و بە پیتی ئەرمەنی هەیە کە دوور نییە لە سەدەی هەژدەدا نووسرابێتەوە "

سەدەی ١٢ تا ١٥

ئەرمەنەکان لە سەدەی دوازدەوە تا سەدەی پازدەم بەردەوام ڕووبەڕووی هێرشی تۆرانییەکان (سەلجوقی و مەنگۆلی و تورکمانی) دەبنەوە تا ئەو کاتەی لەلایەن عوسمانییەکانەوە لە ١٤٧٣ لە سەردەمی سوڵتان محەمەدی دووەمدا داگیر دەکرێ.

(ابن بطوطە)ی مەراکشی، کە لەو ساڵانەدا بە کوردستاندا تێ پەڕیوە، لە سەفەرنامەکەی خۆیدا دەڵێ: «ئۆرخان سەدان کۆشک و تەلاری جوانی لە خەڵکی بێدەسەڵاتی ئەوێ زەوت کردبوو و خەڵکی بنەماڵەی خۆی لەوێ ئاخنیبوو. تەنانەت کڵێسایەکەشی داگیر کردبوو و کردبووی بە مزگەوت.

١٢٥٤

جوگرافیاناسی ئەرمەن، هیتوومی یەکەم HETDUM I کە لە ساڵی ١٢٥٤دا بە کوردستاندا تێ پەڕیوە و چووەتە تەورێز، باسی پێوەندیی نێوان ئەرمەن و کوردی کردووە.

١٣٠٠

ئەدەبی کلاسیکی ئەرمەن، کە لە سەدەی ١٤ی زایینییەوە دەست پێ دەکات، گەلێک بابەتی وای تێدایە کە چۆنایەتیی پێوەندییەکانی ئەرمەن لەگەڵ دراوسێ و هۆزە کوردەکان بەگشتی ڕوون دەکاتەوە.

١٤٠٠

نوێژە مەسیحییەکەی تۆماس مێتسۆب

کوردناسی فەرەنسایی، تۆما بوا، دەڵێ: لە ساڵی ١٩٣٧دا، پرۆفیسۆر عەبدوڵڵا زادە لە ئارشیڤخانەیەکی کۆنی ئەرمەنییەکاندا لە شاری ئێتشمیازین Etchmiadzin بە خەتی مێژوونووسی ئەرمەنی، تۆماس مێتسۆپ T. METSOP (کە لە ١٤٤٦دا مردووە) دەسنووسێکی دۆزییەوە کە لە ساڵانی ١٤٠٠دا نووسراوە و چەندان ئەلفابێی جۆرەوجۆری تێدایە.. هەروەها چەند نوێژێکی مەسیحییەکانی تێدایە بە حەوت زمانی جیاواز، لەوانە بە زمانی کوردیش.

Thomas BOIS: Bulletin Raisonne d Etudes Kurdes, Imprimerie Catholique, Beyrouth: 1964. P. 551. -

– لە ژمارەیەک دەسنووسی ئەرمەنیدا چەند دێڕێکی کوردی بە ئەلفوبێی ئەرمەنی نووسراوە. یەکێک لەو دەسنووسانە لەبارەی ڕێزمانی ئەرمەنییە و لە سەدەی پازدەدا نووسراوەتەوە، بەڵام چەند نزایەکی بە عەرەبی و فارسی و کوردیی تێدایە.

گەلێک لە سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە لەو سەردەمەدا ئەلفابێی ئەرمەنی و سیریاک (ئاشووری) لە کوردستاندا بەکار هاتبن.

ڤ. مینۆرسکی، " کۆنترین تێکست بە کوردی". باسی تێکستێکی یەک دێری کوردیی دەکات کە ساڵی ١٩٣٨ لە تفلیس لەناو دەستنووسێکی ئەرمەنیدا هاتووە و بە قسەی مینۆرسکی ئەم تێکستە کوردییە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی پازدەم و ئەگەر کۆنتریش نەبێت. بڕوانە:

648-V. Minorsky, “Le plus ancien texte en Kurde. “In Bull. mensuel du Centre d'études Kurdes, Paris, 1950, n* 10, p. 8-10.

هەروەها، د. ن. مەکەنزی، "زمانی میدییەکان". ئەم وتارە لەسەر چەند ڕستەیەکی کوردی بینا کراوە کە شانیزەر لە وتارێکی خۆیدا باسی ئەلفوبێیەکی تازە دەکا بەگوێرەی دەسنووسێکی کۆنی ئەرمەنی تازە دۆزراوە کە –کە بەگوێرەی شانزەر– مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی پازدەم و ڕەنگە لە نێوان ساڵەکانی ١٤٣٠ تا ١٤٤٦ نووسرابێ. لەم دەسنووسەدا تەنیا تاقە دێڕێکی کوردیی تێدایە کە بە زمانی میدی (کوردی) نووسراوە. نووسەر شیکردنەوەیەکی ئەم دێرەی بە زمانی میدی کردووە و بە هیچ شێوەیەک دژی ئەوە نەبووە کە زمانی میدی بە کوردی دابنێ. بڕوانە:

David Neil MacKenzie "The Language of the Medians", In: BSOAS 22, 1959, pp. 354-355.

١٤٩٢

پەنابەرە جوولەکە ئیسپانیاییەکان کاتێ کۆچیان کرد بەرەو تورکیا، دەزگای چاپیان لەگەڵ خۆیان بردە تورکیا، سوڵتانی عوسمانی مۆڵەتی چاپی کتێبی پێیان دا بەڵام بە مەرجێک کتێبەکان

بە ئەلفوبێی عەرەبی نەنووسرێن. دواتریش ئەم مۆڵەتە بە کەمینە مەسیحییەکانیش درا، هەتا سەدەی هەژدەم لە سەرانسەری حوکمڕانیی عوسمانیدا کتێب بە خەتی عیبری، یۆنانی، ئەرمەنی، سریانی و هەندێک جاریش لاتینی چاپ دەکرا.. بەڵام نەک بەو خەتە عەرەبییەی کە عوسمانی و موسڵمانەکان کەڵکیان لێ وەردەگرت.

١٥١٢

سوڵتان سەلیمی یەکەم کە لە سەردەمی ئەودا زۆربەی خاکی کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. وردە وردە خاکی ئەرمەن و دینی ئاشوورییەکان و زمانی چەرکەسەکان و مێژووی قپتییەکان و ناسکاییی ئازەرییەکان و خۆڕاگریی ڕووسەکان و جوانیی مازەندەران و کانیاوی گەیلەک و سامانی گورجستان و شکۆی داغستان، تەنانەت کەرامەتی ئاوی نیل و بیاوانەکانی سعوودیەی عەرەبیش.. هەموویان وردە وردە دەکەونە ژێر چەکمە و شمشێری ئەم هۆزە عوسمانییە وەحشیگەرایەی کە لە کۆتاییدا دەبێتە گەورەترین ئیمپراتۆریەتی دنیا.

بەم شێوەیە، لە سالآنی (١٥٠٠) بەملاوە، ئەم فەرمانڕەوا تورکە عوسمانییانە، بە زەبری شمشێر و ئاگر و چەک، پەیتا پەیتا بازنەی دەسەڵات و پاوانکارییەکانی خۆیان فراوانتر دەکەن: لە دیوی ڕۆئاوادا بەرەو یۆنان و بولگارستان، لە دیوی ڕۆهەڵاتیشدا بەرەو داگیرکردنی زۆربەی شارەکانی کوردستان. ئیتر لە سالآنی (١٥٠٠) بەملاوە سێ چارەگی خاکی کوردستانی گەورە و ئەرمەنستانیش، وردە وردە دەکەونە ژێر شمشێر و ڕەحمەتی خوانەناسانەی ئەم بنەماڵە تورکە عوسمانییانەوە.

١٥١٤

لە شەڕی چاڵدێران، لە نێوان شا ئیسماعیلی سەفەویی ئێران و سوڵتان سەلیمی عوسمانیدا، تورک نیوەی کوردستانی ئەمڕۆ لەسەر ناوی خۆیان تاپۆ دەکەن.

مەلا ئیدریسی بدلیسی (بەتلیسی) ئەو کوردەی کە لە ئیمپراتۆریای عوسمانی پایەکی بەرزی هەبووە بە فارسی ساڵی ١٥٠١ (هشت بهشت)ی نووسیوە کە مێژووی یەکەمین هەشت سوڵتانەکانی عوسمانیی نووسیوەتەوە؛ خزمەتی زۆری بە سوڵتان سەلیمی یەکەم کردووە، لە ساڵی ١٥١٥ سوڵتان سەلیم بە تێلەگە و دیارییەکی زۆرەوە ڕەوانەی لای سەرکردە کوردەکانی (لە گۆتیۆم و زاگرۆس) کردووە بۆ ئەوەی خۆیان لە هاوپەیمانێتی لەگەڵ فارسەکان دوور بگرن و لایەنگری دەوڵەتی عوسمانی بکەن.

بوڵتەنی ئەرمەنی دەڵێ: کوردەکان سەبارەت بە سوننیبوونیان بە هانای سوڵتان سەلیمی عوسمانی کەوتن و یارمەتییان دا بۆ ئەوەی سەرکەوتنی بەغدا وەدەست بهێنێ. ئیدریسی بەتلیس، یەکێک لە کوردە بەتوانا و دەسەڵاتدارەکانی ئەو سەردەمە، کاتێ لە بەغدا گەڕایەوە، بە سوڵتان سەلیمی ڕاگەیاند کە کوردەکان دەیانەوێ لەگەڵ تورکیا ببن بە یەک. ئیدی بەسترانەوەی

کوردستان به تورکیاوه هیچ گیروگرفتێکی نەهاتە سەر ڕێ.

Bulletin Armenien
30 Mors, 15-30 Avril 1920,p.4-5.

١٦٢٣- ١٦٤٠

سوڵتانی عوسمانی موڕادی چوارەم ( ١٦٢٣-١٦٤٠) سەردانی ڕۆهەڵاتی کوردستانی تورکیا دەکات و فەرمان دەردەکا بە بووردنی میرە فەرمانڕەواکانی ئەرمەن لە باجدان. ناوچەکانی خوارووی دەریاچەی وان و دۆڵی موک لەژێر دەسەڵاتی خانەوادەی عەبدال خانی بەتلیسیدا بوون کە هیچ کاتێک لێپرسراوێتیی کەسی قەبووڵ نەبوو.

سوڵتان موڕادی چوارەم لە ١٦٣٥ تەورێزی گرت، لە ١٦٣٦ بەغدایشی گرت. ئینجا لە ١٦٣٨ سەرجەم مەڵبەندەکانی مزووری و ئامێدیی سووتاند و وێرانی کردن بۆ ئەوەی کوردەکانی ئەو ناوچانە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

١٦٢٧

دوای دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوی لە سەردەمی شا ئیسماعیلی سەفەوی، فارسەکان توانییان کەناری ڕۆهەڵاتی ئەرمینیا داگیر بکەن. لە شەڕی نێوان فارس و عوسمانییەکاندا، فارسەکان ئەرمینیایان داگیردەکرد. دوای ماوەیەکی تر عوسمانییەکان لێیان دەسەندنەوە و دەکەوتەوە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان، تا ساڵی ١٦٢٧ ئەو کاتەی شای ئێران ناچار دەبێ بۆ بەرژەوەندیی عوسمانییەکان دەست لە ئەرمینیا و گورجستان هەڵبگرێ (نادر شای ئێران کە بۆ ماوەیەکی کورت ئەرمینیای خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی نەیتوانی ئەم گێڕانەوەیە بپارێزێ بۆیە ئەرکی پاراستنی ئەرمینیای بۆ ڕووسیا جێ هێشت، ئەوە بوو کە ڕووسەکان دەستیان بەسەر ئەم سامان و سەروەتەدا گرت. ئەوسا دوای ئەوەی نادر شا دەست لە ئەرمینیا هەڵ دەگرێ ڕووسە قەیسەرییەکان دەسەڵاتی تەواوەتییان بەسەر ئەوناوچەیەدا سەپاند.

١٦٤٠

سوڵتان ئیبراهیم هاتە سەر حوکم و هەر هەموو کڵێساکانی ئەرزەڕۆمی کرد بە مزگەوت.

١٦٨٢

یەکێک لە ڕۆهەڵاتناسە ئیتاڵییەکان کە لە ١٦٨٢دا ماوەیەک لە دەوروبەری مووسڵ لەگەڵ کاپووسانە پیاوە مەسیحییەکاندا ژیاوە، دەڵێ: " ئێمە لە کاتی پێویستدا دەمانتوانی بەئاسانی خۆمان فێری زمانی کوردی بکەین، ئەمەش لە ڕێگەی بەکارهێنانی قامووس و کتێبی ڕێزمانی کوردییەوە کە لای ئابێ پیرە مەسیحییەکاندا دەست دەکەوتن. دەمانبینین، پێشانیان دەدایین.

چونکە ئەوان لە ڕێگەی چوونە ناو خەڵکەوە باش فێری زمانەکە بووبوون.

١٦٨٧

برای محەمەدی چوارەم، سلێمانی دووەم دەبێتە سوڵتان و زۆربەی کوردە مەسیحییەکانی ناوچە شاخاوییەکانی، بەزەبری ئاگر و شمشێر کرد بە موسڵمان.

١٨١٢

میر بەدرخان لە ساڵی ١٨١٢ دێتە سەر حوکم دوای ئەوەی دەوڵەتەکە دادەمەزرێنێ کە لە ساڵی ١٨١٢ تا ١٨٤٨ دەخایەنێ.

لە ئەنجامی نیانیی مامەڵەی ئەمیر و چاوپۆشین لە ڕابردوو توانیی دڵی خەڵکی ناوچە و دەوروبەری بۆ دۆزەکەی بکێشێ بەتایبەت ئەرمەنەکان کە ئەوپەڕی هاوکارییان لەگەڵ کرد، ئەرمەنەکان لای میر بەدرخان پایە و مەکانەتێکی تایبەتیان هەبوو بە چاوی کورد سەیری دەکردن. بۆیە هەندێک لە مێژوونووسان دەڵێن بەدرخان پێی وابوو کە کورد و ئەرمەن بە ڕەچەڵەک یەکن. بۆیە ئەرمەنەکان بە حوکمی شارەزایی و پسپۆڕییان توانییان بەسەر هەموو کەناڵە ئابووری و بازرگانییەکانی دەوڵەتدا زاڵ بن، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە هەموو ئەرمەنەکان بچنە پاڵی و ئەویش پشتیان پێ ببەستێ و ببنە جێی متمانەی ئەو، لە هەموو بوارەکانی کار و پایەکان شوێنیان هەبوو وەکو ڕاوێژکار (ستیبان مانوگلیان و ئەرگانیش تشالکزیان) ڕاوێژکاری بەدرخان بوون. یەکێک لە ئەفسەرەکانی ئەرمەنی فەرماندایەتیی سوپایەکی کوردی بەدرخانی دەکرد، زۆربەیان شانازییان بە ئەرمەنایەتیی خۆیان دەکرد لە کاتێکدا کە تورکەکان ئەو مافەیان لێ قەدەغە کردبوون.

١٨٢٧

رووس لەو هەوڵەدا بوون کە بوونی خۆیان لەو ناوچانە بسەلمێنن. ئەوسا لە ڕێککەوتنی ئاشتەواییی تورکمان شای ساڵی ١٨٢٨دا دەکەونە ڕێککەوتنێک کە بەهۆیەوە هەموو گورجستان و بەشێک لە ئەرمینیا (هەرێمی قەرەباغ و ولایەتی یەریڤان و نەخجیوان) دەبنە بەشی رووسیا هەروەها ئەم پەیماننامەیە مافی بە ئەرمەنەکانی ئێران دا کە بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان لەژێر دەسەڵاتی رووسیا. بەم بڕیارە نێزیکەی ٢٥ هەزار ئەرمەنی لە دانیشتوانی پارێزگای ورمێی سەر بە ئێران گەڕانەوە ئەرمینیا.

١٨٤٨

رۆهەڵاتناسی ئەڵمانی جوهانس لیبسیوس کە لە ڕەوشی کورد و ئەرمەنەکان بە ئاگا بوو باس لەو دۆستایەتییەی کورد و ئەرمەنەکان دەکات لە ١٨٤٨دا دەڵێ دۆستایەتی و پێوەندییەکانیان ئەوەندە خۆش و تەبا بوو گەیشتبووە ئاستی ژنخوازی و تێکەڵاوی، کوردەکان زۆر ڕێزیان لە نەریتە

ئاینییەکانی ئەرمەنەکان دەگرت.

١٨٥٦

کاتێک عوسمانییەکان هێرش دەکەنە سەر شۆڕشەکەی بەدرخان و تێکی دەشکێنن ئەرمەنەکان لە هەڵوێستە جوامێرییەکانیان پاشگەز نابنەوە، شان بەشانی میر بەدرخان بەرگری دەکەن ئەو هێرشە کە عوسمانییەکان بە هاوکاریی ئینگلیز کردیانە سەر کورد و ئەرمەن بەیەکەوە بەرۆکیان لێ گرتبوو تا راپەڕینەکەی ١٨٥٦ کە یەزدان شێر پێی هەڵسا هەمان هەڵوێستیان هەبوو ئەو ڕاپەڕینەی دوای شەڕی قرمی نێوان دەوڵەتی ڕووسیای قەیسەری و دەوڵەتی عوسمانی کە عوسمانییەکان بە دڕندەیی دایان مرکاندەوە.

١٨٥٧

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم بەملاوە، یەکێک لە سەرەتاکانی پەخشانی کوردی و دەستپێکردنی وەرگێڕان لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، بەهۆی هاوکاریی ئەرمەنەکانەوەیە کە دەردەکەوێت: یەکەم وەرگێڕانی ئینجیل بۆ کوردی بریتییە لە ئینجیلێک لە ساڵی ١٨٥٧ لە زمانی یۆنانییەوە کراوەتە دیالێکتی کرمانجی و بەئەلفوبێی ئەرمەنی چاپ کراوە، لە ٣٩٨ لاپەڕەدا، لە ئەستەمبۆڵ، لەلایەن مسیۆنێر و قەشە ئەرمەنییەکانەوە بڵاو کراوەتەوە.

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم بەملاوە سەرەتایەکی نوێ لە جموجۆڵی وەرگێڕان لە ئەدەبی کوردیدا دەردەکەوێت، ئەویش بریتییە لە وەرگێڕانی ئینجیل و کتێبە دینییە مەسیحییەکان بە هاوکاریی ئەو قەشە و پاتریارکە ئەرمەنییانەی کە لە ئەستەمبۆڵ و لە کوردستانی تورکیادا دەژیان.

موژدەگارەکان Missionnaires ئەو قەشە و دیندارە مەسیحییانەن کە دەنێردرانە هەندەران بۆ بە مەسیحیکردنی خەڵکی غەیرە مەسیحی. ئەم موژدەگارانە، لە ویلایەتەکانی وان و بەتلیس دا، لە دەوروبەری ساڵانی ١٨٥٠ەوە ڕەگ و ڕیشەی خۆیان داکوتاندبوو. لەناو ئەوانەدا ئەرمەنییەکان لە پێش هەموویانەوە پڕوپاگەندەی دینییان بۆ دەکردن و یارمەتییان دەدان. جەنەراڵ شەریف پاشای کورد، لەم بارەوە دەڵێ:

موژدەگارەکان کاتێ پێیان نایە کوردستان، ڕوویان کردە عەشیرەتە مەسیحییەکانی کوردستان. لەناو ئەم عەشیرەتانەشدا ئەرمەنییە ئۆرثۆدۆکسییەکان لە هەموو کەسێک زووتر و ئاسانتر چوونە ژێر بارەوە. «٢٨»

پێوەندی و هاوکارییەکی توندوتۆڵ، بۆ وەرگێڕانی ئینجیل و کتێبە دینییە مەسیحییەکان، بۆ سەر زمانی کوردی، لە نێوان موژدەگار و پیاوە دینییە ئەرمەنەکاندا هەبووە. موژدەگارەکان لەم بارەیەوە سوودیان لە پاتریرک و قەشە و ڕووناکبیرە ئەرمەنەکانی کوردستان وەردەگرت، چونکە:

١ـ زۆربەی قەشە و پاتریک و ڕووناکبیرە ئەرمەنەکانی کوردستان، خاوەن توانا و ڕۆڵێکی گەورە بوونە؛ کوردییان دەزانی و دەیانتوانی کاری وەرگێڕان بۆ سەر زمانی کوردی بکەن.

٢ـ ئەرمەن لە هەموو میللەتێکی ڕۆهەڵات زیاتر نێزیک بووە لە کورد، دراوسێی یەکتر بوونە، لە ڕووی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و دینیشەوە خزمایەتی و پێوەندییەکی دێرینیان هەبووە، لە ڕووی سیاسیشەوە هاوئازار و هاوچارەنووس بوونە.

یەکەم وەرگێڕانی ئینجیل بۆ زمانی کوردی، بریتییە لە ئینجیلێک کە لە ساڵی ١٨٥٧دا، لە زمانی یۆنانییەوە کراوەتە دیالێکتی کرمانجی و بە ئەلفوبێی ئەرمەنی چاپ کراوە، لە ٣٩٨ لاپەڕەدا. ١٧ بە ١٠ سانتیمەتر، لە بەرگێکی کارتۆنی پتەودا، لە ئەستەمبوڵ، لەلایەن موژدەگارە مەسیحییە ئەرمەنییەکانەوە بڵاو کراوەتەوە. ناونیشانی کتێبەکە، بە دیالێکتی کرمانجی، بەئەلفوبێی ئەرمەنی، ئەمە بووە: ئینجیل. خودێیێ مە، ئیسایێ مەسیح . نڤیساندن ب دەستی ماتیۆس مارکۆز و لۆکاس یۆحەننا، ل ئەستەمبۆلدا، ١٨٥٧.

کتێبی ناوبراو هیچ پێشەکییەکی لەگەڵ نییە، یەکسەر لە لاپەڕەی یەکەمەوە ناواخنی ئینجیلەکە دەست پێ دەکات: لێکدانەوەی مەتتا ( ماتیۆس) لە لاپەڕە ١ تا ١١٢؛ لێکدانەوەی مەرقۆس لە لاپەڕە ١١٣ تا ١٨٤؛ لێکدانەوەی لۆقا لە لاپەڕە ١٨٥ تا ٣٠٨؛ لێکدانەوەی یۆحەننا لە لاپەڕە ٣٠٩ بەملاوە تا کۆتایی، ل ٣٩٨.

لە لاپەڕەی یەکەمدا بەخەتێکی زۆر گەورە نووسراوە ( ئینجیل بە کاڤلا)، لە خوار ئەوەوە بەخەتێکی درشت نووسراوە ( ماتیۆس)، لە خوار ئەویشەوە بەخەتێکی کەمێک درشت نووسراوە (پشکا ١)؛ ئینجا لە دێری یەکەمدا ئینجیلەکە وا دەست پێ دەکات ( کتێبی مەڤلوودێن عیسائێل مەسیح ئی کوڕی ئیبراهیم...).

لاپەڕەکانی کتێبەکە، سەرتاپای کۆپلەکانی، ژمارەبەند کراون. لە سەرەتای هەر کۆپلەیەکدا ژمارەیەک دانراوە. بۆ نموونە، ئینجیلی مەتتا، بەشی یەکەم ٢٥ کۆپلەیە و بەشی دووەم ٢٣ کۆپلە.

پێش ئەم ئینجیلە، هیچ بەرهەمێکی وەرگێڕدراوی تر (لە شێوەی کتێبێکی چاپکراودا) شک نابەین کە لە زمانێکی بێگانەوە کرابێتە کوردی. کەواتە لە بواری مێژووی سەرهەڵدانی جموجۆڵی وەرگێڕان و لێکۆڵینەوە بەراوردکارییە زمانەوانییەکانەوە Etudes Linguistiques Comparatives ، ئەم ئینجیلە بایەخێکی فراوانی هەیە.

بایەخی سەرەکیی ئەم ئینجیلە لەوەدایە کە یەکێکە لە یەکەم نموونەی پەخشانەکان بە زمانی کوردی: دوای چیرۆکەکەی مەلا مەحموودی بایەزیدی، کە بەناونیشانی ( مەم و زین) لە ١٨٥٦دا نووسراوە. لە ڕووی زمانەوانیشەوە ( زاراوەسازی و ڕستەسازی و وشەسازی)، هەروەها لە ڕووی پێشکەوتنی نووسین بە کوردی و پەرەسەندنی ئاستی پەخشانی کوردیشەوە، گرینگییەکی زۆری هەیە. جگە لەمانەش، لە بواری لێکۆڵینەوەی شێواز Sirylistique : شێوازی گێڕانەوەی چیرۆکەکان لەبارەی ژیاننامەی مەسیحەوە، شایانی لێکۆڵینەوەن.

زمانی ئەرمەنی لە کۆنەوە و تا ئێستاش ــ بە ئەلفابێکەشیانەوە ــ لەژێر کاریگەریی زمانی یۆنانیدایە. زمانەکەیان پڕە لە وشە و پەیڤی یۆنانی.

پرۆفیسۆری فرەنسایی ئەرمەنناس Antoine Meillet دەڵێ: ''وەرگێڕی ئینجیلی ئەرمەنی، تێکستە یۆنانییەکەی وشە بە وشە وەرگێڕاوەتە سەر ئەرمەنی. بێ هیچ دەستوەردانێک لە ڕووی ڕستەسازییەوە، ڕەوتی ڕیزی وشەکانی بەتەواوەتی پاراستووە. کەواتە، دەتوانین بڵێین وەرگێڕە ئەرمەنییەکان بەتەواوەتی مۆدێلی نووسین و ناواخنی ئینجیلە بنچینەیییە یۆنانییەکانیان پاراستووە.

ئەم دیاردەیە، بێگومان کاری کردووەتە سەر تەرجەمە کوردییەکەش. چ بە گوێرەی ئەم ئینجیلەوە کە ئەرمەنییەکان لە یۆنانییەوە کردوویانەتە کوردیی ئەلفابێی ئەرمەنی، چ بەگوێرەی ئەو ئینجیلانەش کە ڕاستەوخۆ لە یۆنانییەوە کراونەتە کوردیی ئەلفابێی عەرەبی: زمانە کوردییەکەی ئەم ئینجیلە، بە هەمان شێوە، لەژێر کاریگەرێتیی وشەسازی و زاراوە یۆنانییەکاندا بووە.

لەلایەکی تریشەوە، پەیڤ و کارێگەرێتیی زمانی ئەرمەنی خۆیشی، دیارە، کەم تا زۆر ڕەنگیان داوەتەوە بەسەر زمانە کوردییەکەدا.

نێزیکایەتیی زمانی کوردی و ئەرمەنی هێندە زۆرە، کە زمانەوانێکی ئەرمەنی پێوەندییەکە تەنانەت بەپێچەوانەشەوە دەبینێ، دەڵێ: '' زمانی ئەرمەنی کاریگەرێتیی گەلێک زمانی وەک کوردی و یۆنانی و تورکی و عەرەبی و فارسیی بەسەرەوەیە''.

١٨٦١

دووەم کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی، بە ناونیشانی (ئەلفا بێ جێ یا کورمانجی و ئەرمەنی) لە ئەستەمبۆڵ چاپی دووەمی لە ساڵی ١٨٦١، بە دیالێکتی کرمانجی، بەئەلفوبێی ئەرمەنی، دیسان بە هاوکاریی نووسەر و قەشە ئەرمەنییەکان بڵاوکراوەتەوە. کتێبەکە بە زمانی کوردی و ئەرمەنییە: ستوونێک بە کوردی و ستوونی بەرامبەر بە ئەرمەنی. باسی مێژووی مەسیحییەتە، زیاتر لە (٣٥) نیگاری تێدایە.

ئەم کتێبە وەرگێڕدراوە یەکەم کتێبی منداڵان و قوتابخانەیییە، یەکەم کتێبی لێکدانەوەی دینی مەسیحە، یەکەم کتێبە کە مێژووی بە زمانی کوردی نووسیبێتەوە، یەکەم کتێبی وێنەدارە ـــ بە زمانی کوردی، یەکەم هەوڵدانی داڕشتنی ئەلفوبێیە بۆ زمانی کوردی. هەروەها یەکەم کتێبی کوردی بە ئەلفوبێی ئەرمەنی و یەکەم قامووسی کوردی ــ ئەرمەنییە، کە لە بواری وەرگێڕاندا بایەخێکی گرینگی هەیە. قامووسەکە زیاتر لە ٣٠٠ وشە و زاراوەی کوردی ــ ئەرمەنیی تێدایە، واتایان بە هەردوو زمان روون کراوەتەوە. (بڕوانە پاشکۆی ئەم پەڕتووکە).

ناونیشانەکەی، بە ئەرمەنی و کوردی، نووسراوە. لە خوار ناونیشانی کتێبەکەوە، بە ئەرمەنی نووسراوە: لەم کتێبەدا کۆمەڵەک زانیاری هەن بۆ منداڵان لە کوردستاندا لەبارەی ئاینی

مەسیحییەوە. پاشان، هەر بە ئەرمەنی، نووسراوە :

ئەم کتێبە ئامادە کراوە بە هاوکاری:

١ـ ماتیۆسی ئەرمەنییان لە ئێچمیازین.

٢ـ پاتریرکی ئوورشەلیم، باوە هۆڤان توو.

٣ـ باوە هانکووت سیەلۆ، کە ئەویش هەر پاتریرکە.

٤ـ پاتریرکی ئەستەمبۆڵ، باوە سەرکەسی.

ئینجا بە کوردی نووسراوە:

چاپا دوویێ ١٨٦١

خەلاتیا/ ئەستەمبۆڵ

چاپخانا " هەیڤا نوو"

خوویێ یێ چاپخانا مهەندسیان

بەرگی کتێبەکە: کارتۆنێکی تەنکی زەردە. وێنەی ژنێک و دوو منداڵە پەری، کە لەملا و لەولای دانیشتون، لە ناوەڕاستدا نیگار کێشراون. کتێبەکە ٥٦ لاپەڕەیە. ١٤ بە ٢١ سانتیمەتر. (٤٢) وێنەی تێدایە.

کتێبەکە بە زمانی کوردی و ئەرمەنییە. هەر لاپەڕەیەک کراوەتە دوو ستوون، ستوونێک بە کوردی و ستوونی بەرامبەر بە ئەرمەنییە. ئاشکرایە کە نووسەرە ئەرمەنییەکان، لە سەرەتادا بابەتەکەیان بە ئەرمەنی نووسیوە و پاشان وەریان گێڕاوەتە سەر کوردی. ئەم کتێبە، سەرتاپای، بریتییە لە تێکستی بچووک و جۆرەوجۆر. تێکستەکان (کوردی و ئەرمەنییەکان)، هەموویان لە بەردەستدان بۆ بەراوردکردنیان بە یەکتر.

لاپەڕەی یەکەم، بریتییە لە پێشەکییەک بە زمانی کوردی. لە دێری یەکەمدا نووسراوە: ڤێ ئەلفا بێ هاتە چێکرنی ژبۆ زارۆکێن کوردستانێ. لەو پێشەکییەدا باسی ناوەرۆکی کتێبەکە دەکا.
لاپەڕەی دووەم: هەمان پێشەکی و باسە بە زمانی ئەرمەنی.

لاپەڕەی سێیەم: وێنەیەکی جوانە لەبارەی قوتابخانە و مامۆستا و قوتابییانەوە، قوتابخانە و خوێندن لە پێش چاوی خوێنەران شیرین دەکا. لە خوارەوەش بە ئەرمەنی باسی رۆڵی قوتابخانە دەکا.

لاپەڕەی ٤ ــ ٧، بریتین لە حەرفە ئەرمەنییەکان بەرامبەر بە دەنگەکانی زمانی کوردی. بەرامبەر هەر فۆنەتیک و دەنگێکی کوردی حەرفێکی ئەرمەنیی گونجاو داڕێژراوە. بە زمانی ئەرمەنی باس لە گونجاندنی ئەلفوبێی ئەرمەنی بۆ فۆنەتیکی زمانی کوردی کراوە. هەوڵی ئەوە دراوە کە نووسین و خوێندنەوە بە زمانی کوردی بخرێتە قاڵبی ئەلفوبێی ئەرمەنییەوە و لەمەودوا کوردی بە ئەلفوبێی ئەرمەنی بنووسرێتەوە.

لاپەڕەی ٨ ــ ١٢: چەند دەرس و ڕاهێنانێکی پراتیکین لەبارەی چەسپاندن و پیادەکردنی ئەلفوبێی ئەرمەنی بۆ زمانی کوردی و نووسین بە کوردی. لاپەڕەی ١٣: ( لوغەتێن یەک دەنگی یا کورمانجی و ئەرمەنی). کراوەتە دوو بەش، هەر بەشێکیش کراوەتە دوو ستوون. ستوونێک وشەی کوردین، کە لە ستوونەکەی بەرامبەریدا، واتاکەی بە زمانی ئەرمەنی نووسراوە. ئیدی، قاموسێکی کوردی ــ ئەرمەنیی بچکۆلانەیە. بە هەمووی ١٠٨ وشەی کوردی ــ ئەرمەنییە. وشەکانیش، وەک لە ناونیشانی لاپەڕەکەدا دەسنیشانی کردووە: وشەی یەک سیلابین. نموونەی ئەم وشانەی کە هێناویەتییەوە: ئەز، ئاخ، ئەم، ئاڤ، پاچ، تاڵ، کاڵ.

لاپەڕەی ١٤ ــ ١٥: ( لوغەتێن یەک دەنگی یا کورمانجی و لوغەتێن دوو دەنگیێن ئەرمەنی). بەهەمان شێوە، قاموسێکی کوردی ــ ئەرمەنیی بچکۆلانەیە. بە هەمووی ١٠٤ وشەی کوردی ــ ئەرمەنییە. وشەکانیش، وشەی یەک سیلابیی کوردین بەرامبەر وشەی دوو سیلابیی ئەرمەنی.

لاپەڕەی ١٥ ــ ١٧: ( لوغەتێن دوو دەنگی یا کورمانجی و لوغەتێن دوو دەنگیێن ئەرمەنی). بەهەمان شێوە، قاموسێکی کوردی ــ ئەرمەنیی بچکۆلانەیە. وشەی دوو سیلابیی کوردین بەرامبەر وشەی دوو سیلابیی ئەرمەنی.

لاپەڕەی ١٨: ( لوغەتێن سێ دەنگی یا کورمانجی و لوغەتێن دوو دەنگیێن ئەرمەنی). قاموسێکی کوردی ــ ئەرمەنیی بچکۆلانەیە. وشەی سی سیلابیی کوردین بەرامبەر وشەی دوو سیلابیی ئەرمەنی.

لاپەڕەی ١٩: (لوغەتێن چوار دەنگی یا کورمانجی و لوغەتێن دوو دەنگیێن ئەرمەنی). قاموسێکی رستەی چوار برگەیی کوردی ــ ئەرمەنییە. بە هەمووی ٤٤ رستەی کوردی ــ ئەرمەنییە.

لاپەڕەی ٢٠ ــ ٢٤: کراوەتە دوو ستوون. لە سەرەوەی هەر ستوونێکدا بە کوردی و ئەرمەنی نووسراوە (پیشەسازی هۆی پێشکەوتنە). ئینجا لە خوارەوەدا، لە ناونیشانی ستوونە کوردییەکەدا نووسراوە ( باستماخانە) واتە ( چاپخانە). لەسەر ستوونە ئەرمەنییەکەشدا بەهەمان شێوە نووسراوە ( چاپخانە). بە کوردی و ئەرمەنی، باس لە بایەخ و ڕۆڵی چاپخانە دەکا لە بواری پێشکەوتنی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگەدا. وتارەکە وا دەست پێ دەکات: " ڤێ سووڕەتی ..." . مەبەستی وێنەی ئەو چاپخانەیە کە لە سەرەوەی لاپەڕەکەدا رەسم کراوە.

لاپەڕەی ٢٥: ( دوعایێ خودێ یێ). لاپەڕەکە کراوەتە دوو ستوون. لە ستوونی یەکەمدا، بە زمانی کوردی دەقی ئەو نوێژە نووسراوە کە هەموو بەیانییەک مەسیحییەکان دەیکەن. لە ستوونی دووەمدا هەمان نوێژ بە زمانی ئەرمەنی لە بەرامبەرەکەیدا نووسراوە.

لاپەڕەی ٢٦ــ ٢٩: بە ئەرمەنی نووسراوە ( وشەی بەکارهاتووی رۆژانە). لاپەڕەکە کراوەتە دوو بەش. هەر بەشێکیش کراوەتە دوو ستوون. قاموسێکی کوردی ــ ئەرمەنیی بچکۆلەیە. نموونەی ئەم وشانەی کە هێناویەتییەوە: گەنم، جۆ، نۆک، گڵگڵ، نیسک. بەکورتی، ئەم قاموسە، ناوی

هەمــوو رووەک و خــواردن و باڵندە و گـیـانەوەر و بابـەتەکـانی سـروشـتی تێـدایە. لەژێر وێنەی پڵنگێکیشدا نووسراوە: ئەڤ پڵنگ دنێڤ چیایێن ئەرمەنستانێ دژێت.

لاپەڕەی ٣٠ ــ ٣٣: قـامـووسـێکی کوردی ــ ئەرمـەنییە، لە دوو سـتووندا، تەنیـا بۆ ژمـارەکـان؛ لە ژمارە یەکەوە تا نۆهەت ملیۆن.

لاپەڕە ٣٤ ــ ٥٤: دوو وتـار لە هەشت بـەشـدا، لە دوو سـتـوونی بـەرامـبـەر بـە یەک، یەکـیـان بە کوردی و ئەوی تریان بە ئەرمەنی، لەبارەی مێژووی ئەرمەنستان و بایەخی دینی مەسیحییەوە.

لاپەڕە: ٥٥: پارچە شـیـعرێک، لە سـتوونی یەکـەمدا بە کوردی و لە دووەمـدا هەمـان شـیـعر بە ئەرمەنی.

وەک لە بەرگی کتێبەکەدا نووسراوە: ئەمـەیان چاپی دووەمی کتێبـەکەیە. چاپی یەکـەمی، دیارە، چەند ساڵێک پێش ١٨٦١ بڵاو کراوەتەوە.

بەبۆچوونی ئێمـە: ئەم ڕێبەرە ــ کە نازانین چاپە یەکەمەکەی کەی بڵاو کراوەتەوە ــ یەکەم کتێبی کوردی بـووە بە ئەلفـوبێی ئەرمـەنـی. بەڵگەشـمـان بۆ ئەم قـسـەیە ئـەوەیە کە کـتـێـبی ناوبراو، وەک دەبینین، بەشـێکی گرینگی پێشـەوەی، برێتییـە لە ڕێبـەرێک و بنچینەیەکی زانسـتی بۆ نووسـین بە ئەلفـوبێی ئەرمەنی. ئەگەر پێش ئەم کتێبـە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی ئـەرمەنی لەو سـەردەمەدا هەبووایە، پێویستی بەم ڕێبەرە نەدەکرد چاپ بکرێت. چاپکردنی ئەم کتێبە تەنیا ڕێ خۆشکردنێک بووە بۆئەوەی رۆڵەکانی گەلی کورد ئەلفوبێی ئەرمەنی فێر ببن و بتوانن دوای ئەوە بە زمانی خۆیان ئینجیل و کتێبی دینیی مـەسیـحیی تەرجـەمەکراو و بابەتی گرینگی تری تەرجـەمەکراو ــ وەک لەم کتێـبـەدا دەبینین ـــ بخـوێننەوە. کەواتە، دەبێ ئـەم ڕێبـەری ئەلفـوبێـیـە پێش ئینجـیلەکەی ١٨٥٧ چاپکرابێ.

لە کۆتاییی ساڵانی ١٨٥٠دا، لە کاتێکدا کورد، نەخـوێندەوار، لە خەوی غەفڵەتدا بوون، یانیش لە ڕێگەوبکاندا، کـاروانی ڕێگە دوورەکـانیـان رووت دەکردەوە؛ مـاتیـۆسـێک و سـێ پاتریرکی ئەرمـەنی، وەک لەسـەر بەرگی کتێبـەکەدا ئـامـاژەی بـۆ کراوە، سـەرقـاڵی ئەوە بوون کـە ئەلفـوبێیـەک بۆ زمـانی کوردی دابمەزرێنن و کورد فێری خوێندەواری بکەن، ئینجا پاشان لە سـاڵی ١٨٦١دا ئەم کتێبە بە زمـانی کـوردی ــ بە ئەلفـوبێی ئـەرمـەنی لەبارەی مـەسـیح و ئاشـتی و شـارسـتـانییـەتەوە بنووسن و تەرجـەمـەی کـوردیی بکەن؛ رۆڵی دین و چاپخـانە و پیشـەسـازی لـە پێشکەوتنی ژیـانـی مـرۆڤدا بۆ کوردان روون بکەنەوە.

ئەم موژدەگار و پاتریرکە ئەرمەنییانە، بێگومان، زۆربەیان، پێویستە زمـانی کوردییان زانیـبێت. ئەوانە، ئەگەر ڕێبـەری ئەلفوبێ و کتێبی قـوتابخـانەییی لەم چەشنەیان بۆ منداڵان لەو سـەردەمـەدا وەرگێڕابـێتە سەر زمانی کوردی و بڵاویان کردبێتەوە؛ بێگومان لەوانەیە چەند قوتابخانەیەکیشیان بۆ منداڵانی کورد کردبێتەوە بۆ ئەوەی ئەم دەرسە زمانەوانی و دینییانەی تێدا بڵێنەوە.

ئەم کتێبە وەرگێڕدراوە یەکەم کتێبی منداڵان و قوتابخانەییە، یەکەم کتێبی لێکدانەوەی دینی مەسیحە، یەکەم کتێبە کە مێژووی بە کوردی نووسیبێتەوە، یەکەم کتێبی وێنەدارە ــ بە زمانی کوردی، یەکەم هەوڵدانی داڕشتنی ئەلفوبێیە بۆ زمانی کوردی.

هەموو نووسراوەکانی نێو ئەم کتێبە، بە دوو تێکستی بەرامبەر بە یەک: بە دوو زمانی ئەرمەنی و کوردی لە دوو ستوونی بەرامبەر بە یەکدا نووسراون. کوردییەکە، بێگومان، دەبێ لە ئەرمەنییەکەوە تەرجەمە کرابێ.

هەروەها ئەم کتێبە یەکەم قامووسی کوردی ـ ئەرمەنییە، کە لە بواری وەرگێڕاندا بایەخێکی گرینگی هەیە. قامووسەکە زیاتر لە ٣٠٠ وشە و زاراوەی کوردی ـ ئەرمەنێی تێدایە، واتایان بە هەردوو زمان روون کراوەتەوە. وەرگێڕ و زمانەوان و قامووسەوانە کورد و ئەرمەنەکان دەتوانن سوودێکی زۆری لێ ببینن.

ئەم کتێبە: یەکەم هەوڵدانە کە تێکستی تەرجەمەکراوی، لە هەمان لاپەڕەدا، لە ستوونێکی بەرامبەردا، لە تەنیشت تێکستی لێوەرگیراوەکە دانابێت. ئەم کارە، زیاتر یارمەتیی خوێنەر دەدا بۆ ئەوەی بتوانێ تێکستەکان لەگەڵ یەکتر بەراورد بکات. ئەلفا بێ جێ یا کورمانجی و ئەرمەنی: پەخشانێکی سفت و جوانی نووسینی کوردیی ناوەڕاستی سالآنی سەدەی رابردووە، شایانی لێ وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەیەکی زۆرە.

نووسەرانی ئەم کتێبە، لە وتارە تەرجەمەکراوەکاندا، باسی بایەخی چاپخانەیان بۆ کوردان کردووە، رۆڵی چاپخانە و زانستییان لە پێشکەوتنی کۆمەڵ و بیری مرۆڤدا، بە زمانێکی ئاسان باس کردووە. ئەمە بۆ ئەو کاتە زۆر بووە. بایەخی ئەم کتێبە لە رووی رێزمان و زاراوەناسی و وشەسازی و رستەسازییەوە، هەروەها لە رووی پێشکەوتنی نووسین بە زمانی کوردی و پەرەسەندنی ئاستی پەخشانی کوردییەوە، گرینگییەکی زۆری هەیە.

موژدەگار و پاتریرکە ئەرمەنییەکان، لە وەرگێڕانی ئەم ئینجیل و کتێبە دینییانەدا بە ئەلفوبێی ئەرمەنی و سریانی، چەند ئامانجێکی گرینگیان هەبووە:

١ــ بلاوکردنەوەی ئەلفوبێی ئەرمەنی و سریانی، لە جیاتیی بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبی، بۆ نووسین و خوێندنەوەی زمانی کوردی: بۆ ئەوەی گەلی کورد لە ئەلفوبێی عەرەبی، واتە لە کولتووری تورکی و فارسی و عەرەبی دوور بکەونەوە و ببن بە خاوەن کولتوورێکی ئەرمەنی ــ مەسیحی.

٢ــ بۆ ئەوەی خەڵکی کورد بتوانن ئینجیل و کتێبە دینییە مەسیحییەکان بخوێننەوە و روو بکەنە باوەڕهێنان بە دینی مەسیح.

٣ــ بۆ ئەوەی خوێندەواری و رۆشنبیری لەناو خەڵکی کورددا بلاو ببێتەوە و گیانی برایەتی لە نێوان ئەرمەن و کورددا دروست ببێت.

٤ــ بۆ ئەوەی ئەرمەنییەکانیش، بەتایبەتی ئەو ئەرمەنییانەی زمانی خۆیان بیر چووبووەوە و بە زمانی کوردی قسەیان دەکرد، ئەوانیش سوود لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە وەربگرن.

بۆ دەسنیشانکردنی خەسڵەتەکانی ئەم یەکەم وەرگێڕدراوە چاپکراوانە، ئەم تێبینییانە تۆمار دەکەین:

– وەرگێڕەکان لەم قۆناغەدا کە کتێبیان تەرجەمەی سەر زمانی کوردی کردووە، کورد نەبوونە؛ بگرە خەڵکێکی بێگانە بوونە، واتە موژدەگارە رۆئاواییەکان و قەشە ئەرمەنییەکان.

– ئەم وەرگێڕە بیانییانە، نووسەر و شاعیر و مێژوونووس نەبوونە، بگرە پیاوی دینی مەسیحی بوونە: پاتریرک و ماتیۆس و قەشە.

– مەبەستیان لە وەرگێڕان مەبەستێکی ئەدەبی یان هونەری نەبووە، بگرە مەبەستێکی دینییان هەبووە: بڵاوکردنەوەی دینی مەسیح لە کوردستاندا.

– ئەم کتێبە تەرجەمەکراوانە، لە زمانی یۆنانی و ئەرمەنی و سریانییەوە تەرجەمە کراون.

– ئەم کتێبە تەرجەمەکراوانە، کاریگەرێتیی زمانی یۆنانی و سریانی و ئەرمەنییان بەسەرەوە هەبووە.

– بڵاوبوونەوەی ئەم بەرهەمە وەرگێڕدراوانە زیاتر لە باکوری کوردستاندا بووە، بەتایبەتی کوردستانی تورکیا.

– ئەم بەرهەمە وەرگێڕدراوانە، زۆرتر بە دیالێکتی کرمانجی و بە ئەلفوبێی ئەرمەنی یان سریانی بوونە.

١٨٧٨

– پەیمانی سان ستیڤانۆ (٣ی ئاداری ١٨٧٨) و پەیمانی بەرلین (١٣ی تەمووزی ١٨٧٨) لە نێوان دەوڵەتانی زلهێز و ئەرمەنەکاندا؛ بەپێی ئەم دوو پەیمانە مافی حوکمی ئۆتۆنۆمی دەدرایە ئەرمەنییەکان.

– دوای ئەوەی رووس بە تەواوەتی دەستیان بەسەر ناوچەی قەوقاسدا گرت چاویان بڕییە ئەوەی بگەنە (ئاوە گەرمەکە) و بەنداوەکانی بسفۆر و دەردەنیل، بۆیە دەبووایە شەڕێک لە نێوان ئەوان و دەوڵەتی عوسمانی روو بدا، ئەوە بوو دوای هاتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بۆ سەر حوکم شەڕێکی رووسیی عوسمانی لە ١٨٧٨ هەڵگیرسا کە بە سەرکەوتنی رووس بەسەر عوسمانییەکاندا تەواو بوو. (ئەرمەنییەکان، بەپێی پەیمانەکانی سان ستیڤانۆ لە ٣ ی ئاداری ١٨٧٨ و بەرلین لە ١٣ی تەمووزی ١٨٧٨ مافی حوکمی ئۆتۆنۆمییان پێ درابوو). پێ دەچێ لەو سەروبەندەدا بێت کە حاجی قادری کۆیی گوتوویەتی:

خاکی جزیر و بۆتان یەعنی وڵاتی کوردان

سەد حەیف و مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان

محەمەدی مەلا کەریم لە شیکردنەوەی شیعرەکانی حاجی قادری کۆییدا، دەڵێ:

لە زەمانی عوسمانییەکاندا نیشتمانی نەتەوەیی ئەرمەن دوو پارچە بوو، پارچەیەکی لەژێر دەستی عوسمانییەکاندا بوو، ئەو پارچەکەشیان لەژێر دەستی رووسیای قەیسەریدا. پارچەی ژێر دەستی عوسمانییەکان لە پیسترین شێوەی ژیاندا دەژیا، وە نارەحەتترین چەشنی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و ئاینیی بەسەرەوە بوو. پارچەکەی تریشی هەرچەند هەروا ژێردەست بوو، بەڵام حکوومەتێکی رووکەشی هەبوو کە داردەستی قەیسەریای رووسیای قەیسەری بوو بۆ راکێشانی دڵی ئەرمەنییەکانی عوسمانی. حکوومەتی عوسمانییش لە زەمانی حاجیدا لە دوارۆژەکانی ژیانیدا بوو، وە هێزی لەبەر برابوو. چ دەوڵەتە ئیستیعمارییەکانی رۆئاوا و چ رووسیای قەیسەری هەریەکە لە لایەکەوە قەپاڵیان گیر کردبوو لە لەشی (پیاوی نەخۆش) – وەک ئەو رۆژە بەحکوومەتی عوسمانییان دەوت – وە دەیانویست رۆژێ زووتر لە پێی بخەن و کەلەپوورەکەی دابەش بکەن لە بەینی خۆیاندا. بەم پێیە زۆرانبازییەکی سەخت لە بەینی ئەم وڵاتە تەماعکارانەدا پەیدا بووبوو، بۆ ئەوەی هەر کامیان بەشێکی زۆرتری لە کەلەپووری عوسمانییەکان دەس کەوێ و باشتر بەرهەڵستی سەرکەوتنی ئەویان بکا. لەسەر ئەم بنچینەیە هەردوو لای ئەم دوو ئۆردووگایە هەوڵی ئەوەیان بوو چاکتر جێی خۆیان لە دڵی نەتەوەی ئەرمەندا بکەنەوە کە لە خەباتێکی سەختی خوێنیندا بوو بۆ دەسخستنەوەی سەربەخۆیی وڵاتەکەی، وە لە هەموو ئازادیخواهانی گێتییەوە پشتیوانییەکی گەرمی لێ دەکرا، هەتا کار گەیشتە رادەیەک مەسەلەکەیان کەوتە ناو بەینی دەوڵەتان و ئەوەندەی نەمابوو مافی خۆیان وەرگرن. ئا لەم کاتەدا حاجی بێ ئەوەی لە ناوکرۆکی ئەم خەباتەی نەتەوەی ئەرمەن بگات، وە لەبەر شوێنی عاتیفەی رووت کەوتن، دێتە دەنگ بەرانبەر بەئازادیی ئەرمەن و سەربەخۆیی ئەرمەنستان، وە بانگ دەکا بۆ پووچکردنەوەی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی لەم بارەوە دەدرا، وە بەبێ ئەوە بەخۆی بزانێ دەبێ بە پارێزەری مەسڵەحەتی داگیرکەرە تورکەکان، وە رێگەی ئیشکردن بۆ کورد دادەنێ تا ببن بەکۆسپ لە رێی مافە راستەکانی ئەرمەندا و ئاخ هەڵدەکێشێ بۆ ئەوە کە چۆن گەورە گەورانی کورد نەماون تا راپەرن بۆ بەرهەڵستیی مەسەلەی ئەرمەن.

حاجی لەم پارچە شیعرە درێژەی، پڕ لە هەستی لێشاوکردووی دووربینانەی کوردایەتیدا، هەندێ شتی وتووە وایان لێوە دەردەکەوێ دژی تێکۆشانی گەلی ئەرمەن بووبێ لە پێناوی دیاریکردنی چارەنووسی خۆی و وەرگرتنی سەربەخۆیی ئەرمەنستاندا:

خاکی جزیر و بۆتان، یەعنی وڵاتی کوردان
سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بەئەرمەنستان
وا رێگەتان دەبەسرێ عێلاتی جاف و بڵباس
گەر مردوون لە گەرمێن مەمنووعە بچنە کوێستان

کـامی کچ و هەتیـوی شـیـرین بێ رایدەکـێـشن
هاوار دەبەنە بەر کێ؟ پەشـمـە دەخـیل و ئامـان
مـەسـجـیـد دەبێـتـە دێرە، ناقـووسـیـان مـوئەززین
مـەتران دەبێـتـە قـازی، مـوفـتـی دەبێـتـە ڕەهبـان
هیچ غیـرەتێک نەماوە سـەد جار قەسـەم بە قورئان
پەیدا بێ ئەرمـەنسـتـان نامـێنێ یەک لـە کـوردان
سـەرتان لـە قـورِ هـەڵێن، ئەحـواڵمـان ببـێن
چۆنـین لە دەسـتی زوڵمی بێ دینی دوور لە ئیـمـان
وەڵلاهـی سـوممە بـیـلـلا، تەڵلاهـی ئەم بـەلایە
هەر هێندی پێ دەزانن ئیـقلیـمی کـردە تۆفـان
تۆفـانـی ئاو نیـیـە هیـچ دەرچێ لە کـێـوی جـوودی
بەحـری تفـەنگ و تۆپە، ئینسـانە بەحـری عـوممان
ئەم قـسـەیەی کـە کـردم ناگـاتە چەند سـاڵی تر
ئەم حـاڵەتـە دەبینن یەک یەک بەچاوی خـۆتـان
حـاڵ ئێسـتـێکە وەهایە مـەگـەر خـودا بەسـووکی
تێکیـان بدا وە ئیلـلا دوورە لە عـەقـڵی ئینسـان
هـەرچی وەکـوو بـەیانم بۆ کـردوون بەتەحـقـیق
پەیدا دەبن سێ گـانە، کـام قـورِ بکەین بەسـەرمـان
لەم بـەینـە ئیـتـتـیـفـاقێ پەیدا بکەن بەمـەردی
فـەرقی نـەبێ شـوان و جـووتیـار و مـیـر و گـاوان
گـەر هـیـچ نـەبـێ بە ئۆین تابیع بە دەوڵەتێ بن
بێگانە چاکـە دوشـمن نەک دوشـمنی لە خـۆتان
ڕۆمی وەکوو بەنی موون کەس پشتیان پێ نەبەستێ
کەوتوونە داوی خۆیان، سـەرگەشتە ماون و حەیران
کـوا والیی سـەنەندوج، بەگـزادەیی ڕەواندوز
کـوا حـاکـمـانی بابان، مـیـری جـزیر و بۆتان.

تا دەڵێ:

کوا ئەو دەمەی کە کوردان ئازاد و سەربەخۆ بوون
سوڵتانی موڵک و میللەت، ساحێبی جەیش و عیرفان

جۆشێک بدەن وەکوو هەنگ، تەگبیر بکەن بەبێ دەنگ
ئەسبابی شەڕ پەیدا کەن: تۆپ و تفەنگ و هاوان
پاڕانەوە و تەوەککول لەم عەسرە پارە ناکا
تیرە دوعایی جەوشەن، پەیکانە حیرزی مەیدان
بۆچی بەشیری ئێمە یەعنی ڕەسوولی ئەکرەم
هیچ ئەدعییەی نەزانی ڕۆژێ کە دەچووە مەیدان

کە ئەم پارچە شیعرە دەخوێنینەوە هەست دەکەین ئەوەندەی نەماوە تێکۆشانی گەلی ئەرمەن بۆ گەیشتن بەئازادی و سەربەخۆیی، پێ بگا و بێتە بەر. بە هاتنەبەریشی مەسەلەی گەلی کورد بەتەواوی دەبێ بەژێرەوە و بۆ خۆیشی لەناودەچێ و شناسنامەی ئاینی و نەتەوەیی خۆی لە دەست دەدا و، بۆیە حاجی داوای هەستانەوەی گەلی کورد دەکا بۆ بەربەرەکانێی ئەرمەن و پرۆژە پەلهاوێژییەکانیان.

محەمەدی مەلا کەریم، ڕاڤەکاری شیعرەکانی حاجی دەڵێ: من کە یەکەم جار ئەم مەسەلەیەم لە کتێبی «حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد(٢)»دا هێناوەتە ئاراوە، ئاگام لە تەنیا ڕوویەکی مەسەلەکە بووە کە بەدادیی مەسەلەی ئازادیخوازیی ئەرمەنە و هەر ئەوەندەی لێ تێ گەیشتووم کە حاجی قادر دژی مەسەلەی ئەرمەنە و پێی وایە بە سەرکەوتنی گەلی ئەرمەن و دروستبوونی ئەرمەنستان کورد و کوردستان دەکەونە بن دەستی ئەرمەن و، ئەمەیش دیارە هەڵەیە چونکە گەلی کورد و ئەرمەن دوو گەلی جیان و هەریەکە وڵاتی خۆی هەیە. حاجی لەم جۆرە تێگەیشتنەی خۆیەوە گەلی کورد بانگ دەکا بۆ بەگژداچوونی ئەم ویستەی گەلی ئەرمەن.

محەمەدی مەلا کەریم دەڵێ:

حاجی پەی بەوە نابا کە کورد و ئەرمەن هەردووکیان گیرۆدەی دەستی یەک داگیرکەر بوون، وە بانگ ناکا بۆ یەککگرتنی هەردوو لایان لە خەباتێکی پێکەوەدا بۆ ڕزگاربوونی هەردوولا، وە ناچێ بەگژی کردەوەی ناپەسندی عوسمانییەکاندا کە هەموو جارێ هەستی ئاینیی کوردەکانیان دەبزواندەوە و دەیانکردن بەگژی ئەرمەندا و خوێنێکی زۆری هەردوولایان بەڕشتن دەدا، وە هەر سەرۆکێکی کورد کە هەوڵی بدایە بۆ برایەتیی کورد و ئەرمەن بێ سەرنوگومکردن دەسیان لێ هەڵنەدەگرت. نەتەوەی کوردیش لەبەر پێنەگەیشتنی هەستی نەتەوایەتیی خۆی لەم پیلانەی عوسمانییەکان تێ نەدەگەیی تا پێی هەڵنەخەڵەتێ.

محەمەدی مەلا کەریم دەڵێ:

ئەرمەنییەکان لەم بارەوە گەلێک لە ئێمە لە پێشتر بوون. ئەوەبوو سەرۆکی پارتیی (تاشناکسیۆن)ی ئەرمەنی کە ناوی (ڕوسدۆم) بوو لە هاوینی ١٨٩٥ – ١٨٩٦دا لە (جنێڤ) چاوی

بە(عەبدورەحمان بەدرخان) کەوت بۆ ئەوەی هەوڵی هەردوولا یەکخەن، وە هەتاوەکو بەدرخانیش بەیاننامەیەکی بە زوبانی کوردی وە بەپیتی عەرەبی لەم بابەتەوە بۆ نەتەوەی کورد بڵاو کردەوە لە ڕۆژنامەی (ترۆشاک)ی ئەرمەنیدا.

١٨٧٨

لە ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری کە لە ڕاپەڕینە مەزنەکانی کوردی دێتە ئەژمار لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم دەستی پێ کرد. ئەم ڕاپەڕینەش بەهۆی هاوکارییەکانیانەوە پێوەندییەکی تری پتەوی لە نێوان کورد و ئەرمەن دروست کرد، سەرەڕای ئەوەی ئەو کات ئەرمەنەکان تازە ماوەیەکی کورت بوو مافی حوکمی ئۆتۆنۆمییان بەپێی پەیمانەکانی سان ستیڤانۆ لە ٣ی ئاداری ١٨٧٨ و بەرلین لە ١٣ی تەمووزی ١٨٧٨ پێ درابوو.

شێخ عوبەیدوڵڵا نوێنەری خۆی بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان ناردبوو داوای لە سەرکردە کوردەکان کردبوو کە هاوکاریی بکەن بۆ ئەوەی لە داگیرکەرانی تورک و ئێرانی رزگاریان بێ و دەوڵەتی کوردی دامەزرێنن. پێی ڕاگەیاندبون کە ئەوان (داگیرکەران) هیچ مافی ئەوەیان نییە حوکمڕانی لە کوردستان بکەن، نوێنەری بۆ کوردەکانی ڕووسیاش ناردبوو تا هاوکاریی براکانیان بکەن، بۆیە شێخ بە زەروروری زانی سۆزی نەتەوە دراوسێکانیش بۆ خۆ بکێشێ ئەوانەی بەیەکەوە لەگەڵ کورد دەژین وەکو ئاشووری و ئەرمەن و عەرەب چونکە هاوکێشە و هاومەینەتن، (پێوەندیی لەگەڵ سەرکردەی ئاشوورییەکان کرد کە مار شەمعون بوو ئەویش بەڵێنی هاوکاریی بە شێخ دا)، بایەخی زۆریشی بە ئەرمەنەکان دا چونکە بەیەکەوە دەژین.

زیاتر لە بۆنەیەک شێخ ڕای دەگەیاند کە ئێمە و ئەرمەن براین، دەبێ تەبا و یەک بین، هەر بۆیەش ئەرمەنەکان پشتگیریی خۆیان بۆ شێخ دەربڕی. ئاسۆکانی دەست پێشخەری هاوپەیمانێتیی کورد و ئەرمەن و ئاشووری دژی تورکەکان بەدی دەکران. هەوڵەکانی ئینگلیز بۆ دوورخستنەوەی ئەرمەن و ئاشوورییەکان لەو هاوپەیمانێتییە نەزۆک بوون. بیانووی ئینگلیز لەو دوورخستنەوەیە ئەوە بوو گوایە تەنیا ئەوروپا بۆی هەیە کریستەکان بپارێزێ.

شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (کە سەرکردەی تەریقەی نەقشبەندیی سەرتاسەری کوردستان بوو) لای ئەرمەن و ئاشوورییەکان جێی متمانە بوو، بەتایبەت ئەو کاتەی لە کۆنگرەی ئامادەکاری بۆ ڕاپەڕین لە وەڵامی ئەوانەی دژی پەیماننامەی بەرلین بوون و وتی: تورکەکان دەیانەوێ بەدەستی ئێمە لە کریستەکان بدەن ئەو کاتەی ئەوانی لەناوبرد ئەوسا ڕوو لە ئێمە دەکەن و لەناومان دەبەن. ئێمەش لەوە بە ئاگاین.

شێخ لە ڕێنوێنییەکانیدا بۆ ڕاپەڕیوە کوردەکان جەختی لەسەر پاراستنی سەر و گیانی بێگانەکان کردەوە بەتایبەت ئەرمەن و ئاشوورییەکان داوای کرد کە هەر ماڵە و ئالایەکی شین هەڵواسێ بۆ ئەوەی کەس تخوونی ئەو ماڵە نەکەوێ. مینۆرسکی مێژوونووسی ڕووسیایی کە لەو

سەردەم ژیاوە، بە دەقی وتەکەی دەڵێ (هیچ لە ئەرمەنەکان زیانیان لە بزووتنەوەکەی عوبەیدوڵلا پێ نەگەیی»).

١٨٨٨

وەرگێڕانی چەند بەشێکی ئینجیل و پەیمانی نوێ و چەند پەندێک، بەئەلفوبێی سـریانی Syr-yaque لە ساڵی ١٨٨٨دا.

بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی ئوسامە نەقشبەندی و جەمیل رۆفائێل: زمانی کوردی لە سەدەی نۆزدەمدا بە ئەلفوبێ و خەتی سریانی ( کرشونی) نووسراوە. بۆ سەلماندنی ئەم راستییەش، تۆژەرانی ناوبراو دەسنووسێکیان لە کتێبخانەی (الاثار) دۆزیوەتەوە و باسێکیان لەسەر نووسیوە.

لە ژمارە ١٤ ــ ١٥ی هەمان کۆواردا، د. یوسف حبی، سەرنووسیاری کۆوارەکە، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە جگە لەم دەسنووسە، دوو دەسنووسی تریش ( لە هەمان بابەت) بە زمانی کوردی بە خەتی سریانی لە کتێبخانەی (دێری خاتوو ئالقووش) هەبوونە؛ لەم دواییەدا گواستراونەتەوە کتێبخانەی (دیر الرهبان) لە دۆرەی شاری بەغدا کە ژمارە ٣٠٥ و ٣٠٦یان ( لە بەشی القواعد، المعجمات، الاشعار) دراوەتێ.

ئەوەی یەکەم، بەپێی سەرچاوە فرەنسایییەکەی پشتی پێ بەستراوە: رێزمانی کلدانی ( سریانی/ رۆهەڵاتی) ــ کوردی، لەگەڵ تەرجەمەی چەند بەشێکی پەیمانی نوێ؛ وێڕای چەند پەندێک، بە ئەلفوبێی کلدانی ( سریانی /رۆهەڵاتی). قەوارەکەی: ٢٣ بە ١٦ سم، حەڤدە پەڕاوە، هەر پەڕاوێکی ١٩ دێرە. لە ١٨ی ئابی ١٨٨٨ لە (ئەرادن) لەلایەن ئێلیا هەمۆ ئەلئەلقوشی نووسراوەتەوە.

دووەمیان: رێزمانی کوردی لەگەڵ تەرجەمەی چەند بەشێکی ئینجیل (هەردووکیان ١٨ پەڕاون)؛ هەروەها چەند نامەیەکی مار پۆڵس، لەگەڵ قامووسێک، نووسراوی: قەشە ئەبلەحەد ( هەردووکیان ٧ پەڕاون). ئەمە هەمان کتێبی پێشووە، بەڵام چەند پەڕاوێزێکی بۆ زیاد کراوە. ٢٢ بە ٥ سم. هەر لاپەڕەی ١٨ دێرە. ( قەشە ئەلشەمماس) ئێلیا هەمۆ ئەلئەلقوشی نووسیویەتییەوە.

شایانی باسە، نووسین بە زمانی کوردی – بە ئەلفوبێی سـریانی Syryaque مێژوویەکی لە ١٨٨٨ کۆنتری هەیە؛ دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (١٤٠٠ز).

١٨٨٩

د. عەبدوڵلا جەودەت، دامەزرێنی یەکەمین رێکخراوی سیاسی کە لەلایەن کوردەوە دامەزرابێت لە ساڵی (١٨٨٩) لە ئەستەمبۆڵ، بۆ یەکەمین جار ناو لەم نەسلە کوردە رووناکبیرە نوێخوازە دەنێ (کوردە گەنجەکان). ناوبراو بۆ خۆیشی یەکێک بوو لەو وەچە گەنجە گۆڕانخوازە و دامەزرێنی رێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی) بوو کە پاشان بووە هۆی دروستبوونی (بزاڤی گەنجە تورکەکان).

١٨٨٩

مۆسیقاناسی ئەرمەن، کۆمیتاس، تێزێک لەبارەی گۆرانی و مۆسیقای کوردی دەنووسێت و (١٣) گۆرانیی کوردی بە نموونە دەهێنێتەوە و نۆتەیان بۆ دادەنێ.

– محەمەدی مەلا کەریم، ڕاڤەکاری شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی، دەڵێ: حاجی دەهات بەراوردی کوردی دەکرد لەگەڵ نەتەوەکانی تر کە بە زوبانی خۆیان دەیانخوێند و دەیاننووسی، وە ئەیوت هەر هیچ نەبێ چاوێک لە ئەرمەنییەکان بکەن کە:

بە زوبانی کەچ و خەتی خواری
بە جەریدە و کتێبی خەڵواری
چوونە ڕیزی موعەززەماتی میللەل
وەختە خۆیان حیساب بکەن بە دووەل

لە پێش ئەم دوو بەیتەوە بەیتێکی تریش هەیە کە بەراورد لە نێوان دوو زمانی کوردی و ئەرمەنیدا دەکا و ئەڵێ:

لە فەساحەت بڵا موعەڕڕا بێ
چ قیامەت! بە ئەرمەنییش نابێ»

حاجی لێرەدا جێگەی ڕەخنە لێ گرتنە کە بە شێوەیەکی وا باسی زوبان و خەتی ئەرمەنی دەکا کە مانای بە سووکی سەیرکردنیان بگەیەنێ، لە کاتێکدا کە پێویستە لەسەر هەموو ئادەمیزادێکی بەشەرەف، نەخوازەڵا ڕۆشنبیران و تێکۆشەران، کە بەچاوی ڕێز لێ گرتنەوە سەیری هەموو نەتەوەیەک بکەن، وە قەدری خوو و ڕەوشت و زانست و مێژوویان بزانن، وە لە کاتێکدا کە هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن ساڵانی ساڵ گیرۆدەی دەستی یەک داگیرکەر بوون، وە مێژوویەکی تێکەڵیان بووە کە تا ئێستاش هەر ماوە. ئەوەتا ئێستا کەمایەتیی کورد باشترین و پێشکەوتووترین ژیان ئەژیی لە ئەرمەنستانی سۆڤیەتیدا، وە ئەوەتە هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن تاڵ و سەختترین ژیانیان هەیە لە ژێردەستی حوکمڕانە فاشیستەکانی تورکیادا.

هەروەها حاجی بەراوردی پێشکەوتنی گەلی ئەرمەن دەکا، بۆ ئەوەی کوردیش چاو لە ئەوان بکەن:

ئیستێکە موستەقیللن، مەحسوودی کوللی ئەدیان
بولغار و سیرب و یۆنان، هەم ئەرمەن و قەرەتاغ
هەر پێنجیان بە تەعداد نابن بەقەددی بابان
هەر ئێکە موستەقیللن، کوللێکی دەوڵەتێکن
ساحێبی جەیش و ڕایەت، ئەرکانی حەرب و مەیدان

یان:

هەم حەقیقیانە ئەرمەن غیرەتکەشی یەکترن
وەک ئێمە نین لەگەڵ یەک دەعوا بکەن بەشیران
بۆ فەننی حەرب و سەنعەت، بۆ زەبت و ڕەبتی میللەت
دەینێرنە ئورووپا گەورە و بچووکی خۆیان

١٨٩١

سوڵتان عەبدولحەمید هۆزە کوردەکانی ڕێک خست بۆ ئەوەی بیانکا بە تیپ و فەوجی سوار تا لە شەڕەکاندا هاوکاریی سوپای تورکی بکەن. سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ناوی لەم تیپ و فەوجانە نا (حەمیدی) ئەمەش وەکو پیرۆزکردنیان بە ناوی خۆی دێت ( لەم سەردەمە پێیان دەوترێ جاش). لە رووی پراکتیکەوە ٧٦ فەوج یا تیپی لێ پێک هێنان، هەر تیپێک یا فەوجێک برێتی بوو لە ٤٠٠ چەکدار کە بە سەرۆکایەتیی سەرکردەی هۆزەکانەوە بوو، ئەمانیش لەژێر فەرماندایەتیی سوپاسالاری عوسمانیی شەشەمدا بوون کە بارەگاکەی لە ئەرزنجان بوو.

ئەم تیپانە زۆر بەهێز نەبوون چونکە هەندێکیان بە دروستی دانەمەزرابوون، ئا لەژێر ئەم دەمامکە نوێیە نێزیکەی ٢٠ تیپیان بە جلە ڕازاوەکانیانەوە بۆ بەرەکانی شەڕ دژی یۆنانستان ڕاپێچ کردن. لە ( ١٨٩٧ز) لە چیاکانیانەوە بەرێگەی ترابزۆنەوە بەرێ کران، دوای ئەوەی لە ئەستەنبۆل مانۆرێکی سەربازییان پێ کردن لەوێشەوە بۆ سالۆنیکا، دواتر رەوانەی بەرەکانی شەڕیان کردن لە بەراییەکانی سوپای تورک لە تیسالی. دوای شەڕ، چواریەکیان کە بە زیندوویتی مابوونەوە بە ئەسپەکانیانەوە گەڕانەوە ماڵ، ئەوانی تر هەموویان تێدا چوون.

هەر لە کاتی دامەزراندنی تیپی حەمیدی (١٨٩١)ەوە دەبینین هەستی پیاوەتی لەنێو هەندێک لە سەرکردەی هۆزەکان جووڵەی دەکرد بۆیە سەنگەریان دەگواستەوە لە تیپی حەمیدیەوە بۆ سەنگەری گەل. هەندێ جاریش لە کتوپڕی هۆزێک یاخی دەبوو خۆی جیا دەکردەوە.

زۆربەی جار ئەندامانی پەرلەمان لەو دوو گەلەی کورد و ئەرمەن لە دانیشتنەکانی پەرلەماندا هاوهەلوێست دەبوون، گەلێک جار گفتوگۆکانیان سنووری ناکۆکییەکانیانی رەت دەکرد ئەوانەی لەسەر مولک و کێشەکانی تردا هەیانبوو. بۆیە دەبینین لە هاوینی ساڵی (١٩٠٩) فەرمانبەرە نهێنییەکانی لێژنەی تورکیای فەتات بەنێو هەرێمی رۆهەڵاتدا دەخولانەوە و تۆوی فیتنە و ئاژاوەیان لەنێو ڕیزەکانی گەلی ئەرمەن و کورددا دەچاند.

١٨٩٤

لە ساڵی ١٨٩٠ پارتی تاشناق (یەکەتی) دامەزرا کە دروشمی ئۆتۆنۆمیی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا بەرز کردبووەوە بەڵام دوای ئەوەی گەلی ئەرمەن دڵنیا بوون لەوەی سوڵتانی

عوسمانی ئەو چاکسازییە جێبەجێ ناکات کە بەڵێنی لەسەر دابوو واتە دەوڵەت وەک جارانی پێشوو لە سەرجەم پەیمانەکانی پاشگەز دەبێتەوە بۆیە دەبینین ئەرمەنەکان لە ناوچەی ساسۆن لە ساڵی ١٨٩٤ شۆڕشیان هەڵگیرساند.

سوڵتان عەبدولحەمید هەڵگیرسانی ئەم شۆڕشەی بە هەلێکی گونجاو زانی بۆ جێبەجێکردنی ئامانج و نەخشە و پلانەکانی کە برێتی بوون لە جینۆسایدی گەلی ئەرمەنی و داخستنی دۆسیەی چاکسازیی ناوەخۆیی بە پاساوی جیاجیا، لە هەردوو مانگی ئاب و ئەیلوولی ١٨٩٤دا بۆ جاری دووەمیش لە ١٨٩٥دا سوڵتانی عوسمانی بەبەرچاوی تەواوی دەوڵەتانەوە کوشتارگەی بۆ ئەرمەنەکان نایەوە زۆر بە دڕندەیی کەوتە گیان و ماڵ و کڵێسا و گوندەکانیان و بەتەواوەتی جینۆسایدی کردن.

لەم کارەی خۆیدا، سوڵتان عەبدولحەمید بەزۆر داوای لە هەندێ عەشیرەتە کوردەکان کرد کە بەهۆی جیاوازیی دینی کورد لە دینی ئەرمەن بەشداری لە کۆکوژیی گەلی ئەرمەندا بکەن. بەداخەوە هەندێک لە کوردەکانی ژێردەستەی سوڵتان عەبدولحەمید کە بەزۆر داوایان لێ کرابوو، داخوازییە گڵاوەکەی سوڵتان عەبدولحەمیدیان بەجێ گەیاند.

د. کەمال مەزهەر لە کتێبی (کوردستان لە ساڵەکانی یەکەمی جیهانیدا) بەشێکی فراوانی بۆ ئەم جینۆسایدە و پێوەندیی بە کوردەوە تەرخان کردووە، دەڵێ: هەزاران ئەرمەن لە گوند و خێمە و حەشارگەکانی کوردان خۆیان شاردبووەوە، دوای تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانی ژمارەیەکی زۆری ئەرمەن دۆزرانەوە لە کوردستان کە توانیبوویان دەرباز بن.

- بۆ یەکەم جار هەردوو پەیماننامەی سان ستیڤانۆ و بەرلین کێشەی ئەرمەنەکانیان لە کێشەی ناوەخۆ گواستەوە بۆ کێشەیەکی عوسمانیی نێودەوڵەتی.

١٨٩٥

بەپێی (تأريخ الامة الارمنية) ، نووسینی (دوکتۆر أ. استارچیان)، چاپی مووسڵ، ١٩٥١.: ئەرمەنییەکان لەم بارەوە گەلێک لە ئێمە لە پێشتر بوون. ئەوە بوو سەرۆکی پارتیی (تاشناکسیۆن)ی ئەرمەنی کە ناوی (ڕوسدۆم) بوو لە هاوینی ١٨٩٥ - ١٨٩٦دا لە (جنێڤ) چاوی بە(عەبدوڕەحمان بەدرخان) کەوت بۆ ئەوەی هەوڵی هەردوولا یەکخەن، وە هەتاوەکو بەدرخانیش بەیاننامەیەکی بە زوبانی کوردی وە بە پیتی عەرەبی لەم بابەتەوە بۆ نەتەوەی کورد بڵاو کردەوە لە ڕۆژنامەی (ترۆشاک)ی ئەرمەنیدا.

١٨٩٨

دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بەناوی کوردستان لە ٢٢ی نیسانی ١٨٩٨ لە (قاهیرە - جنێف - فۆلکستۆن)، ڕۆڵێکی باشی لە پتەوکردنی پێوەندییەکانی نێوان کورد و ئەرمەندا بینی. ڕۆژنامەی کوردستان هەر لە سەرەتای دەرچوونیەوە بە دڵێکی کراوە و پڕ بایەخەوە لەلایەن

ئەرمەنەکان و ستافی ڕۆژنامەوانان پێشوازییان لێوە کرا. ئینجا پاشان ڕێکخستنە سیاسییەکانی ئەرمەنییەکان لە تورکیا و دەرەوە ڕۆڵێکی باشیان لە بڵاوکردنەوە و گەیاندنی ڕۆژنامەی کوردستان گێرا بە گەیاندنی ئەو ڕۆژنامەیە بۆ دەستی کوردەکانی هەندەران لە هەر کوێیەک بن. ئەرمەن و کورد لە ڕێگەی ئەو ڕۆژنامەیەوە، جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە هەردوو گەلی کورد و ئەرمەن لە ناڵاندنی ژێر دەسەڵاتی تورک هاوبەشن، هەروەها هەردوو لایەن لەژێر زوڵم و نادادپەروەریی تورکدا دەناڵێنن و بەیەکەوەش خەبات بۆ ڕزگاربوون لەم ژێردەستەییە دەکەن. ڕۆژنامەی (کوردستان) لە ڕەتدانەوەی لێدوانێکی سوڵتان عەبدولحەمید دووەم کە دەڵێ: (کورد دوژمنی ئەرمەنە) لە ژمارەی ٢٧ی ساڵی ١٩٠١دا وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: «عەبدولحەمید دەڵێ کورد دوژمنی ئێوەیە بەڵام ئێمە دەڵێین وا نییە، ئێوە دوژمنی سەرسەختی نەتەوەکانن لەم دەوڵەتە، ئەگەر ئەمە بڕوا بکەن ئەوا هەموو شتێک لەدەست دەدەن، بەڵام ئاخۆ ئێوە دەزانن کە ئەرمەن نابێتە دوژمنتان؟ کەوایە دوژمنی ئێوە خودی سوڵتانە».

لە ژمارەی ١٤ و وتارێکی مەلا ساڵح لە جزیرەوە بڵاو کراوەتەوە، نیگەرانیی خۆی بۆ ئەو دۆخە ستەمکارەی کورد و ئەرمەن دەربڕیوە:

لە سووچێکی ئەم دنیایەدا خەڵک بە کردنەوەی خوێندنگە و ئاوەدانکردنەوە و پرۆژەی خزمەتگوزارییەوە خەریکن، کەچی لای ئێمە سوڵتانەکان بە کاری لەناوبردن و کاولکاریی کورد و ئەرمەنەکانەوە خەریکن.. هانی هەردوولایان دەدەن تا بەگژ یەکدا بچنەوە. ئێمە دەزانین کە ئەرمەن گەلێکن دەیانەوێ بژین، لەو ژێردەستی و چەوسانەوەیە ڕزگاریان ببێ. هەروەها ئەوەش دەزانین کە مەبەستیانە هەردوولامان لەسەر ئەم دواکەوتووییە بمێنینەوە و بەگژ یەکتردا بچین، بەڵام دەبێ دەسەڵاتدارانی تورک ئەو ڕاستییە بزانن ئەمەی ئەوان مەبەستیانە هەرگیز نایەتە دی و نایبیننەوە، ئێمەش لە خەباتماندا لە پێناو پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بەردەوام دەبین.

١٩٠٠

کوردناسی ئەرمەن خ. ئابۆڤیان چەندان زانیاریی گرینگ و کەرەستەی تازە دەخەنە مەیدانی کوردناسییەوە.

– عەبدوڕەحمان بەدرخان، سەرنووسیاری ڕۆژنامەی (کوردستان) حاشا لە کوڕەکەی خۆی دەکا چونکە لە بەرامبەر قەتڵوعامی ئەرمەنییەکاندا هاوهەڵوێستی سوڵتانی عوسمانی بووە.

١٩٠٧

دۆستایەتییەکی تری نێوان کورد و ئەرمەن ئەو پێوەندییە بوو کە لە نێوان سەرکردەکانی تاشناق و ئیبراهیم پاشای مەللی سەرۆکی هۆزی ملان و سەرۆک هۆزە بێلایەنەکان بوو وەکو سلێڤان و حەسنان و حەیدەران و جەبران. ئەم جۆرە پێوەندییانە گەیشتنە ئەو ئاستەی کە هەندێک لە سەرکردە کوردەکان بچنە ریز پارتە ئەرمەنەکان وەکو قاسم بەگ لە ١٩٠٧ لە ریز

پارتی تاشناق درێژەی بە خەباتی خۆی دەدا. هەروەها شێخ زەینەل یەکێک بوو لە سەرکردەی تیرەکانی دەرسیم کە لە مەزنترین بانگخوازانی هاوکاری و هاوپەیمانیی کورد و ئەرمەن بوو. ئەم بانگخوازەی بووە مایەی ئەوەی دەسەلاتدارانی تورک لە ١٩٠٨ تیرۆری بکەن.

١٩٠٩

لەگەڵ ئەمەشدا بەڵگەی وامان بەدەستەوەیە کە ئەوە دەسەلێن پیاوەکانی بازنەی ناوەوەی لێژنەی (تورکیای فەتات) کە زۆربەیان لە رەگەزە تێکەلاوەکان پێک هاتبوون، بە چاوێکی نارەزاییەوە سەیری لەیەک تێگەیشتن و هاوکاریی نێوان گەلی کورد و ئەرمەنیان دەکرد. زۆربەی جار ئەندامانی پەرلەمان لەو دوو گەلەی کورد و ئەرمەن لە دانیشتنەکانی پەرلەماندا هاوهەڵوێست دەبوون، گەلێک جار گفتوگۆکانیان سنووری ناکۆکییەکانیانی رەت دەکرد ئەوانەی لەسەر موڵک و کێشەکانی تردا هەیانبوو. بۆیە دەبینین لە هاوینی ساڵی (١٩٠٩) فەرمانبەرە نهێنییەکانی لێژنەی تورکیای فەتات بەنێو هەرێمی رۆهەلاتدا دەخولانەوە و توی فیتنە و ئاژاوەیان لەنێو ریزەکانی گەلی ئەرمەن و کورددا دەچاند.

١٩١٣

ئەمیر ساڵح بەدرخان لە ژمارەی ٢ی رۆژنامەی یەکبوون لە ٢٩ سێپتەمبەری ١٩١٣ وتارێکی بەتورکی بە ناونیشانی (دەردی کۆمەلایەتیی کوردستان، کورد و ئەرمەن) بلاو کردەوە، لە وتارەکەیدا بەراوردێکی باری کورد و ئەرمەنی کردووە لەم بەراوردەیدا باسی لەو چەوسانەوە و زوڵمە کردووە کە هەریەک لە کورد و ئەرمەن لەسەر دەستی سیاسەتە رەگەزپەرستییەکەی تورکەکان رووبەڕووی دەبنەوە:

ئەو دوو نەتەوەیەی کورد و ئەرمەن کە زۆریان لێ کراوە لەم ناوچەیە بەیەکەوە بژین، گومان لە نیازپاکیی ئەواندا نییە. ئەوان دەخوازن بە ئارامی و ژیانێکی پڕ لە ئاسوودە بۆ خۆیان و نەوەکانیان دابین بکەن، کوردەکان کە لەسەر لووتکە و بناری چیاکاندا دەژین جگە لە ئەرمەنەکان هیچ کەسی تر لە دەوروبەری خۆیان بە دۆست نابینن، هەروەها ئەرمەنەکانیش هەمان هەستیان هەیە، بۆیە دەبێ کوردەکان گومان لە نیازپاکیی ئەرمەنەکان نەکەن و ئەرمەنەکانیش نابێ گوێ لە پڕوپاگەندەی ناحەز و دوژمنان بگرن.

- گۆڤاری رۆژی کورد کۆمەڵەی هیڤی (خوێندکارانی کورد) لە ئەستەنبوڵ لە ١٩١٣ دەریان دەکرد، رۆڵێکی باشی هەبوو لە چارەسەر و توێژینەوەی جەوهەریانەی پرسی کورد و کێشە تایبەتییەکانی پێوەند بە دۆستایەتیی کورد و ئەرمەن و ئاشوورییەکان.

- رۆژنامە ئەرمەنییەکان دەنگۆی دەرچوونی گۆواری رۆژی کوردیان لە رۆژنامەکانی خۆیاندا بلاو کردەوە، رۆژنامەی ئەودیزۆنی ئەرمەنی لە ژمارەی ٢١٤ کە لە ساڵی ١٩١٣ نووسیبووی (چاوەڕوانی ئاسۆیەکی ڕووناک لەم گۆوارە دەکرێ کە بیری پێشکەوتوو لەنێو گەلی کورد بلاو

کاتەوە). هەر لە ژمارەکانی بەراییەوە ئەم گۆوارە وێرای گرینگیدان بە پرسی کورد و دوارۆژی بایەخی بە پێوەندییەکانی گەلی کورد و گەلە دراوسێکانیشی دەدا بەتایبەت ئاشووری و ئەرمەنی یەکێک لە وتارەکانی کە لەژێر ناونیشانی (سەردەمی باپیرانمان سەردەمی ئێمەیە و ... سەردەمی تۆشە) تیایدا هانی گەلی کورد بۆ ژیانی ئاشتەوایی و پێکەوەژیان لەگەڵ گەلە دراوسێکان دەدا بە تایبەت کریستەکان کە لە سەردەمی چەرخی دەوڵەتی ئاشوورییەکانەوە تا حوکمی عەرەبی بەیەکەوە ژیاون ئێستاش کە حوکمەتی تورک سیاسەتی (جیایان کەرەوە دەستیان بەسەردا دەگری) لە نێوان کورد و ئەرمەن و ئاشوورییەکان پیادە دەکات، بۆ بەرپەرچدانەوە ئەم سیاسەتە ناڕەوایەی تورکەکان دەبێ هەموو دەرفەتەکان لە تورک بگرین و رێگەیان پێ نەدەین کەلێن بخەنە ریزەکانمان بۆیە دەبێ یەکەم جار یەکڕیزیی نێوان کورد بپارێزین دواتر نێوان کورد و گەلانی دراوسێ.

– رۆژنامەی (جامـاناک)ی ئەرمەنی لە ژمارەی ١٦٠٨ی ساڵی ١٩١٣ وتارێکی ئەدیب و سیاسەتوانی کوردی عبدوڵلا جەودەت کە بەناوی بانگەواز لە گۆواری هەتاوی وەرگێڕابووە سەر زمانی ئەرمەنی لە وتارەکەدا ئاماژە بە ئەرک و فەرمانەکانی کۆمەڵگەی کوردی دەدات بۆ پێشکەوتن و پێشوەچونی پێوەندییەکانی کورد و ئەرمەن لە رۆژنامەکانیدا بڵاو کردەوە.

– ئەفسەرە عەرەبەکانی سوپای عوسمانی لە ساڵی ١٩١٢ نامەیەکیان لە (بۆلایر) کەوتە دەست کە یەکێ لە سەرۆکەکانی پارتیی یەکگرتن و پێشکەوتنی تورک (حزب الاتحاد والترقي) بۆ ئەفسەرێکی گەورەی لە خۆیانی نووسیبوو. لەو نامەدا نووسرابوو: «عەرەبەکان بدەن بەدەم گوللەی دوژمنەوە و، هەوڵ بدەن خۆتانیان لێ رزگار بکەن، چونکە کوشتنیان سوودمان پێ دەگەیەنێ. بەڵام کوردەکان بیانهێڵنەوە چونکە پێویستمان دەبن لە وڵاتی ئەرمەندا». ئەم نامەیە وەختی خۆی لە زۆربەی رۆژنامە عەرەبییەکاندا بڵاو کرایەوە (کتێبی «مؤتمر الشهداء»، چاپی بەیرووت، ل ٤٥).

١٩١٣

هاوسۆزی جەنەراڵ شەریف پاشا، باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵم و نوێنەری کورد لە کۆنفرانسی ئاشتیی پاریس، لەگەڵ ئەرمەن و کێشەی ئەرمەنییەکاندا؛ جەنەراڵ شەریف پاشا لە کۆواری مەشرووتیەت بە زمانی فرەنسایی دەنووسێ:

١– زۆر بەگەرمی پیرۆزبایی لە هاووڵاتییە کوردەکان دەکەین و ئاواتەخوازین کە بتوانن لەگەڵ ئەرمەنییەکان دەست لە دەستی یەکتر بنێن بۆ ئەوەی بتوانین، بە کردەوەیەکی هاوبەش و هاوخەباتە، لەدەست ئەو بەڵایەی وڵاتەکەمان رزگارمان بێت کە ناوی جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقییە.

mechroutiette, n,47 , p.40 -43 , paris: 1913.

٢– کورد، هەموو خەڵک دەزانێ، زیرەکییەکی وردیان هەیە، هەروەها بەهرەی ئەوەشیان هەیە کە

بتوانن لەناو میللەتانی تردا بتوێنەوە. ئەگەر تا ئەمڕۆ، بەشێوەیەکی گشتی فەرامۆش کرابن لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە، ئەوا بەرپرسیارێتیی ئەم فەرامۆشکراوییە دەکەوێتە ئەستۆی ئیدارەی تورکەکان. ئیدارەی تورک لە جیاتیی ئەوەی بەشێوەیەکی چاک سوودیان لێ ببینێ و بەکاریان بێنێ، ژیانی هەموویانی خستووەتە هەژاری و نەخۆش و نەخوێندەوارییەوە...

مەشرووتییەت، ژمارە (٤٠)، (٨- ٩، مارس ١٩١٣)

٣- کورد هەردەم بەشێوەیەکی ئاقلانە ژیاوە لەگەڵ ئەرمەنییەکاندا. حکوومەتی حەمیدیە و حکوومەتی ئیتیحادییەکان بوو کە کوردیان لەو ساڵانەی دواییدا گلاندە نێو ئەو چڵاوە پیسەی قەتڵوعامی ئەرمەنییەکانەوە.

ئێمەی کورد، ئەمڕۆ، بەقەد دڵسۆزەکانی ئەرمینیا و زیاتریش، شیوەن بۆ ئەو قەتڵوعامە دەگێڕین. لە تۆڵەی ئەم قەتڵوعامە و دەنگدانەوەی لە جیهاندا، ئەمڕۆ ئەرمەنییەکان دەیانەوێ دەوڵەتێکی سەربەخۆیان هەبێت و کورد - وەک کۆیلە - بخەنە ژێردەستی خۆیانەوە. کوردیش، بەشێوەیەکی سروشتی، ناتوانێ ئەم گریمانەیە قبووڵ بکات و بکەوێتە بن دەستی زوڵم و ڕیاکاریی حکوومەتێکی بێگانەی ترەوە. ئەم دوو نەژادە پاکە، پێویستە لە چوارچێوەیەکی قانوونیدا پێکەوە هەڵبکەن، لە پێناو پێکەوەژیانێکی ئاسوودە و ئارام لە دەوڵەتی عوسمانیدا، وەک جارانی پێش قەتڵوعامەکە. چونکە کورد و ئەرمەن، هەرچەندە نەژادیان لێکتر جیاوازە، بەڵام هەمان ڕۆحیات و ئاکاریان هەیە. بەرژەوەندییان لەوەدایە کە هەردوولا، بەشێوەیەکی هاوڕێیانە لەگەڵ یەکتر بژین. هەردوولایان، لە کانگەی دڵەوە حەز لەوە دەکەن کە چەند ریفۆرمێک، لەسەر بنچینەیەکی یەکسانی و دادپەروەرانە بێتە ئارا.

ئەم حەزە هاوبەشەش، وا پێ دەچێ پێویست بێ کە لە خەباتێکی هاوبەشدا کۆ بکرێتەوە. لەم بارەیشەوە، پێویستە هەردوولامان مەنهەجی methodique بین.

mechroutiette, n.40, p.g, mars 1913.

١٩١٤

دوای شەڕێکی قورس لە پادگاکانی وەتیس لە ٣ی مانگی نیسانی ١٩١٤ شۆڕشگێڕە کوردەکان توانیان دەست بگرن بەسەر شاری بدلیس کە کرایە سەنتەری ڕاپەڕین و ئاڵای کوردستانیان لێ بەرز کردەوە، بەڵام دوای ئەوەی ئەم شارە رزگار دەکرێ خەباتگێڕە کوردە ڕاپەڕیوەکان زۆربەیان شوێنە ستراتیجەکان لە دەوروبەری شار جێ دەهێلن و بەشداری لە ئاهەنگ و خۆشییەکانی سەرکەوتن دەکەن ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هاوسەنگیی هێزەکە تێک بچێ و لەشکری تورک بتوانێ بە ئاسانی هێرش بکا و ناوچەکە لە دەست کوردەکان دەربهێنێتەوە. کوردە ڕاپەڕیوەکان زۆر بەڕێزەوە لەلایەن ئەرمەنەکان بەرێ دەکران چونکە لەو ماوەیەدا هیچ گرفت و زوڵمێکیان لێ نەکردبوون.

– ڕۆژنامەکانی ئەرمەنی کە لە هەندەران دەردەچوون شان بەشانی ڕۆژنامە کوردییەکان لە ساڵی ١٩١٤ هەڵوێستیان دژی تورکەکان وەرگرت لە کاتی ڕاپەڕینەکەی بدلیسدا، دەنگوباس و هەواڵی ڕاپەڕینەکەیان زۆر بەوردی و بەرپرسیارانە بڵاو دەکردەوە و شیکردنەوە و توێژینەوەی بەپێزیان لەسەر ئەم پرسە و هەنگاوەکان و ئامانج و خەسلەتەکانیشی بڵاو دەکردەوە. ب. ناڤاساردیان پسپۆڕ لە بواری پرسی کورد نووسیبووی (ڕاپەڕینی بدلیس دەبێ بخرێتە خانەی ڕاپەڕینی کورد دژی تورکەکان).

١٩١٥

گەلی ئەرمەن وەک هەموو گەلانی ئەو ناوچەیە سەرەتا دڵیان بە هاتنی پارتی ئیتیحاد و تەرەقی خۆش بوو بەڵام ئەوان لە ریزی گەلانی قوربانیی دەستی اتحاد وتەرەقیدا بوون لە زەرەرمەندترین گەلی ئەو ناوچەیە بوون کە لە ئەنجامی هەڵمەتی جینۆسایدی ساڵی ١٩١٥ی کە تیایدا زیاتر لە ملیۆن و نیوێک کەسی تێدا چوو.

– لەبارەی کارە کۆکوژییەکەی ئەرمەنەکان کە کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقیی تورک ئەنجامی دابوو، مێژوونووس فائیز غەسین کە شایەتحاڵێکی ئەم کۆکوژییەی ئەرمەنەکان بوو، دەڵێ: «بەرپرسە تورکەکان لاشەی ئەرمەنەکانیان بە جلی کوردی دادەپۆشی، بۆ ئەوەی بیانکات بە کوژراوی کورد و بیانخاتە ئەستۆی ئەرمەنەکانەوە».

١٩١٧

لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی کێشەی ئەرمینیا هاتەوە سەر مێز بەتایبەتی دوای ئەوەی هێزەکانی رووس توانییان بگەنە باکوری ڕۆهەڵاتی تورکیا و پانتاییەکی زۆری هەرێمەکانی ئەرمینیا و کوردستانیان داگیر کرد، بەڵام ئەوەندەی نەبرد بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیزمی ١٩١٧وە رووسیا بۆ کپکردنی ئاگری شۆڕش هێزەکانی خۆی لەو ناوچانە کێشایەوە. ئەوە بوو هێزەکانی ئەرمەنی ناچار بوون بچنە ژێرباری تێکچوونی هاوکێشەکە و بەرگری لە و وڵاتەکەیان بکەن.

لە ٢٥ی ئەیلوولی ١٩١٧ حکوومەتی کیرنسکی دانی بە مافی چارەی خۆنووسینی گەلی ئەرمەنی نا، دوای ئەوە ئیتر ڕێپێدراوی گەلی سۆڤیەتیش لە ٢ی تشرینی دووەمی ١٩١٧ کە دوای وازهێنانی کیرنسکی دامەزرابوو ئەوانیش دانیان پێدانا. ئەوە بوو لە ١١ی کانوونی یەکەمی ١٩١٧ حکوومەتی سۆڤیەتی بڕیارێکی تایبەتی سەبارەت بە ئەرمینیای تورکی دەرکرد کە ئیمزای هەر یەک لە لینین و ستالینی لەسەر بوو ئەمەش دەقی بڕیارەکەیە: «ئەنجوومەنی ڕێگەپێدراو ڕادەگەیەنێ کە حکوومەتی کرێکار و جووتیاران لە رووسیا پشتگیری لە کێشە و مافی ئەرمەنەکانی تورکیا دەکات کە رووسیا داگیری کردووە، ئەو بوارەشیان بۆ دەڕەخسێنێ کە حکوومەتی خۆیان دروست بکەن و رزگارییان جێگیر کەن».

١٩١٨

کۆمەڵەی نیشتمانیی ئەرمەن، سەربەخۆیی کۆماری ئەرمینیای لە ٢٨ی ئایاری ١٩١٨ ڕاگەیاند و شاری یەریڤانیشیان کردە پایەتەخت، بۆیە حکوومەتی عوسمانی ناچار دەبێ لە ٤ی حوزەیرانی ١٩١٨ بەپێی پەیماننامەی باتوم دان بە سەربەخۆیی ئەرمینیا بنێ.

١٩١٩

داخوازینامە نێودەوڵەتییەکەی جەنەڕاڵ شەریف پاشا لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس لە ساڵی ١٩١٩ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی. ئەم هەنگاوە، گرژییەک لە نێوان ئەرمەن و کورد دروست دەکات لەسەر مەسەلەی دیاریکردنی سنووری (ئەرمەنستان) و (کوردستان) چونکە نەوبار پاشای ئەرمەن ئەویش لە هەمان کۆنفرانسدا داخوازینامەیەکی پێشکێش کردبوو و داوای دەوڵەتێکی سەربەخۆی بۆ ئەرمەنستان کردبوو کە سنووره سیاسییەکەی تێکەڵ دەبووە سنووری سیاسیی کوردستان.

– نوورەدین زازا لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا Ma vie en Kurde کە بە زمانی فەرەنسایی نووسیویەتی:

دانیشتوانی کوردی مادن ئەرمەنەکانی شارەکەیان پاراست لە قەسابخانەکانی سەرباز و جەندرمە و تاوانبارەکانی مافی گشتی کە لێپرسراوانی تورک بۆ ئەو مەبەستە لە زیندان بەرەڵایان کردبوون. ساڵی ١٩١٩ کوردەکان یارمەتیی ئەرمەنەکانیان دا بۆ پەنابردنە بەر سووریا و لەو ساڵەدا باوکم کچێکی بچکۆلەی هەتیوی ئەرمەنی گرتە خۆ بە ناوی (جاجۆ) کە ناوی خۆی (ماجدە) بوو و دوای ڕۆیشتنی ئەرمەنەکان لە مادن گەڕەکەکەیان بووبووە خەرابەیەک، بەڵام تایەفەی یۆنانی تا ڕێککەوتننامەی لۆزان مانەوە کە تیایدا بڕیار درا دانیشتوانەکان لە نێوان تورکیای کەمالی و هەریەک لە یۆنان و بولگاریا و ڕۆمانیا و یۆگۆسلاڤیادا بگۆڕدرێنەوە و، یۆنانییەکانی مادن ناچار بوون خانووە خۆشەکان و موڵکەکان و بێستانە جوانەکانیان کە وەک هاوڕێ کوردەکانیان لە دەوروبەری مادن هەیانبوو، بەجێ بهێڵن.

مامەکانم و پوورەکانم و (جاجۆ)– ئەو کچە بچووکە ئەرمەنییەی باوکم لە قەسابخانەکان ڕزگاری کرد– لە قاتی سێیەم دەخەوتن، خزمەتکارەکانیش لە ژوورێکی دیوەخانەکەدا دەخەوتن.

١٩١٩/٢/٢٥

شاندێکی ئەرمەنی لە پەیماننامەی ئاشتەوایی پاریس بەشدار دەبێ کە لە ٢٥ی شوباتی ١٩١٩ دەبەسترا و یاداشتێک دەدا بە سەرۆکایەتیی کۆنگرە تیایدا داوا لە هاوپەیمانان دەکا کە دان بە حکوومەتی ئەرمینیا بنێن و وەکو دەوڵەتێکی سەرکەوتوو لە شەڕی یەکەمی جیهاندا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

لەگەڵ ئەوەی هاوپەیمانەکان لە پەیماننامەی سیڤەر لە ١٩٢٠ دان بە سەربەخۆیی ئەرمینیا دەنێن (دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە روسیا و تورکیا بۆ ئەرمەنەکان) بەڵام حکوومەتی رووسیا هانی هەندێک لایەنی دا بەناوی لێژنەی رزگاری کە کودەتایەکیان ئەنجام دا دژی ئەو حکوومەتە ساوایە بە سەرۆکایەتیی (سیمۆن فراتیان) لە ١٨ی شوباتی ١٩٢١ ئەو کودەتایەیان بە ئەنجام گەیاند و حکوومەتێکیان لە شوێن حکوومەتی نیشتمانی دامەزراند کە ئەوەندەی نەخایاند دووای ئەوەی حکوومەتی یەکەتیی سۆڤیەت بە تەواوەتی دەکەوێتە سەرپێ و دەست دەگرێ بەسەر هەموو ناوچەکانی ڕووسیای قەیسەری کە لەوانە ناوچەی قەوقاسیشی دەگرتەوە، روو لە یەریڤان دەکا و لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٢١ داگیری دەکا و رای گەیاند کە ئەرمینیا بەشێکە لە یەکەتیی سۆڤیەتی.

ئەوە بوو دامەزراندنی حکوومەتی دوای قەوقاسی راگەیاند کە برێتی بوو لە ئەرمینیا و ئازەربایجان و گورجستان. لە ١٩٢٦ لە دەستووری نوێی وڵات بە تەواوەتی هەڵوەشایەوە ناونرا بە - یاسای بنەڕەتی دەوڵەتی سۆڤیەتی - کە بەو پێیە دەوڵەتی سۆڤیەتی راگەیەندرا و ئەرمینیاش لە بچووکترین ئەو ١٥ دەوڵەتە بوو کە یەکەتیی سۆڤیەتیان پێک دەهێنا، ناوەکەشی بووە کۆماری ئەرمینیای سۆڤیەتیی سۆشیالیست.

١٩١٩/١٢/٢٠

شەریف پاشا رێککەوتننامەیەکی دووقۆڵی لەگەڵ نۆبار پاشای ئەرمەنییەکان مۆر دەکات و بەپێی ئەم رێککەوتنە، دەست لە چەند شارێکی کوردی هەڵدەگرێت بۆ نۆبار پاشای ئەرمەنی..

١٩٢٠

ئەرمەنییەکان، هەم ئەوانەی ناو کۆماری ئەرمەنستان، هەم ئەوانەیش لەناو تورکیا و لە ئەوروپا دەژیان، لە دوای کۆتاییی شەڕی یەکەمی جیهانی، پڕ بە دڵ حەزیان دەکرد کوردستان ببێتە دەوڵەت و بە سەربەخۆیی خۆی بگات. (بوڵتەنی ئەرمەنی Bulletin Armenien) کە کۆوارێکی ئەرمەنییەکان بووە لە پاریس بە فرەنسایی بڵاو کراوەتەوە، لە ساڵی (١٩٢٠) لە ژمارە (١٩-٢٠)دا دەڵێ:

«هاوئاینبوونی کورد و تورک بە هیچ شێوەیەک ڕەوایی ناداتە ئەوەی کە شەریف پاشا ئۆتۆنۆمیی کوردەکان لەژێر سەرپەرشتیی تورکیادا بە باشتر بزانێ، چونکە ئاشکرایە جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی لەم بابەتە لە «تەڵەیەک» زیاتر هیچی تر نابێ. مەسەلەی ئاین پێوەندییەکی یەکجار زۆر کەمی بە سەربەخۆیی نەتەوەیی و ئازادییەوە هەیە. خەباتی گەلی ئەرمەن خەباتێکی ئاینی نییە. بگرە تاقە ئامانجێکی ئەوەیە کە ئێمەی گەلی ئەرمەن بە سەربەخۆیی نەتەوەییی خۆمان بگەین. لە سۆنگەی هەمان شتدا ئێمە هیواداریین گەلی کورد لە رێگەی خەباتی جیابوونەوە و ئازادیخوانەی خۆیدا هەر جەسوور و بەردەوام بێت».

– نوورەدین زازا لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا نووسیویەتی:

سیاسەتەکانی مستەفا کەمال کوردیان نیگەران کرد، هەروەک چاوبڕینی ئەرمەن لە باکوری کوردستان نیگەرانی کردن، سەرەڕای ئەوە هەندێک ناسیونالیستی کورد ئامادەییی خۆیان دەربڕی بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ ڕێکخراوەکانی ئەرمەن لە پێناو پێکهێنانی دەوڵەتێکی ئەرمەنی و یەکێکی کوردیدا و، چەند ڕێککەوتنێکیش لە نێوان نوێنەرەکانیاندا ئیمزا کرا بەمەبەستی ئەوەی داواکانیان پێشکێشی پەیماننامەی (سیڤەر ١٩٢٠) بکەن، کە سەرگەرمی ئامادەکاری بوون بۆ لێکۆڵینەوەی چارەنووسی گەلانی نیشتەجێ لە چوارچێوەی خاکی ئیمپراتۆریی عوسمانیدا. ئەو کاتە هێشتا بزووتنەوەی میلليی کورد بازووی بەهێز نەبووبوو، لە بەرامبەردا مستەفا کەمال سیاسەتێکی سەربازیی و مایکاڤیلیانەی دووفاقی گرتە بەر و بەخێرایی ئەو قازانجانەی چنییەوە کە دۆخەکە بۆی ڕەخساندبوو و، سوودی لە ئازارەکانی کورد و هیواکانی وەرگرت. ئەو لێکگەیشتنی نێوان کورد و ئەرمەنی لە پاریس بەخیانەت دانا و ئامادەییی دەربڕی بۆ دانی ئۆتۆنۆمی بەکورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی نوێی تورکی ڕزگارکراو لە داگیرکەری دەرەکی و، بڕوای وابوو ئینگلیزەکان لەم ئەرکەدا یارمەتیی دەدەن.

کورد تا ڕادەیەکی زۆر بڕوایان بە بۆچوونەکانی هێنا، تەنانەت یەکەمین یەکەکانی خۆبەخت لە شارە کوردییەکانی (ئەرزەڕۆم، وان و بەدلیس) پێک هێنرا. ئەمانە ئەو شارانەن کە ئەرمەنەکان چاویان تێ بڕیبوون. مستەفا کەمال کۆمەڵێکی ٦٠ کەسی لە سەرۆکە دیارەکانی کورد لە خۆی کۆ کردبووەوە و بەوانە دژایەتیی ناسیۆنالیستەکانی کوردی دەکرد کە بەدوای چارەسەرێکی نێودەوڵەتیی کێشەی کورددا دەگەڕان و لەمەشدا پشتیان بەپشتیوانیی ئینگلیز قایم بوو،

١٩٢٥

لە ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت، میکائیلی ڕەشید شیعری نوێ بڵاو دەکاتەوە.

– کابرایەکی ئەرمەنیی ڕەسام، لە کۆتاییی ساڵانی بیستەکاندا لە هەولێر، ڕەسامێکی زۆر گەورە بوو، کوردی ئەودیو، ناوی جەهانگیر بووە. دیمەنی سروشتی کوردستان و جوانی کوردەواریی دەکرد، " دانیال قەسابی هونەرمەند، لە هەمان ئەو ساڵانەدا، لەژێر تەئسیری ئەودا هاتە مەیدانی هونەر".

– زۆربەی وێنەگر و نیگارکێشەکانی کوردستان ئەرمەن بوون.

١٩٢٥

بزووتنەوەی دووەم کە بووە شایەد بۆ پێوەندییە خۆشەکانی نێوان کورد و ئەرمەن ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران بوو لە ١٩٢٥ .

شێخ فەرمانی بۆ هەموو لایەک دەرکرد کە بەهیچ شێوەیەک دەستدرێژی نەکرێتە سەر

سەروماڵی ئەرمەن و ئاشوورییەکان چونکە شێخ درکی بەوە دەکرد کە تورکەکان نیازیانە درزێک بخەنە دۆستایەتیی کورد و ئەرمەن و ئاشووری بۆ ئەم مەبەستە ئاگادارییەکی بە هەموو کوردێک دا و فەرمانی دا کە (هەر کەسێک دەستدرێژی بکاتە سەر ئەرمەنەکان ڕووبەڕووی توندترین سزا دەبێتەوە). ئەم فەرمانەی شێخ سەعیدی پیران دەنگ و سەدایەکی زۆری لە نێوەندی کوردەکان دایەوە. سەرەڕای ئەو پشێوییەی لە کاتی ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین ناوچەکە بەخۆیەوە بینی ڕۆژنامەکانی تورکی و بیانی هیچ سەرپێچی و دەستدرێژییەکی کوردەکانیان بۆ سەر ئەرمەنەکان تۆمار نەکرد. هەروەکو شێخ سەعید و سەرکردە کوردەکانی تر گومانی ئەوەیان هەبوو کە تورکەکان هەوڵی بڵاوبوونەوەی نائارامی و پشێوی دەدەن بۆ ئەوەی ناکۆکی بکەوێتە نێوان کورد و ئەرمەنەکان.

– لە ساڵی ١٩٢٥ نووسەری شەهید، یەکێک لە منەوەرەکانی ئەو سەردەمە، جەمال عیرفان، کتێبێک بە ناونیشانی کورد لە کەیەکەوە خەریکە؟ لە نووسینێکی ڕۆبێن پاشای ئەرمەنییەوە دەکاتە کوردی و لە بەغدا لە چاپخانەی فورات بڵاوی دەکاتەوە. ئەم کتێبە دەبێتە یەکەم کتێبی تەرجەمەکراوی کوردی لە کوردستانی عێراقدا. لە کوردستانی ئێرانیشدا، لە سابڵاغ (میرزا عەزیز زەندییە، مەشهوور بە ئەڵمانی) لەسەر داخوازیی مسیۆنێرەکان، لە زمانی ئینگلیزییەوە کتێبێکی دینی مەسیح وەردەگێڕێتە سەر کوردی و ناونیشانی (ارشاد المذنبین)ی دەداتێ.

١٩٢٦

هەڵگیرسانی شۆڕشی ئاگری، بە سەرکردایەتیی بەرۆ پاشا هەسکی و ئینجا جەنەراڵ ئیحسان پاشا، کە لە زستانی ١٩٢٦ لە ناوچەکانی دەوروبەری چیای ئاگری بەرپا بووبوو، بووە خاڵی وەرچەرخانێکی زۆر باش و پۆزەتیڤ لە پێوەندییەکانی کورد و ئەرمەن.

٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧

پاش سەرکوتکردنی شۆڕشی ١٩٢٥ی شێخ سەعیدی پیران لە کوردستانی تورکیادا، سەرۆک عەشیرەتە شۆڕشگێڕ و بەرپرسی ڕێکخراوە سیاسییەکانی کورد، زۆربەیان، لەلایەن ڕژێمی ئەتاتورکەوە ئاوارەی عێراق و ئیران و سووریا و لبنان کران. لە کۆتاییدا پێوەندییان بە یەکتر کردەوە و بڕیاریان دا «کۆنگرەیەکی نەتەوەیی» ببەستن و ڕێکخراوی (خۆیبوون) دامەزرێنن.

یەکەم دانیشتنی کۆنگرە، لە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧دا پێنج ڕۆژی خایاند، لەوێ لەسەر پرەنسیپە بنچینەییەکان ڕێک کەوتن، لە هاوینەهەواری (بیحەمدوون) لە لبنان، تا ٢١ی مانگ درێژەیان بە کۆبوونەوەکان دا. زۆربەی سەرچاوەکان دەڵێن کە ئەم زنجیرە کۆبوونەوانە، زۆربەیان لە ماڵی سەرۆکی ڕێکخراوی ئۆپۆزیسیۆنی پارتی ئەرمەنی (داشناک) بەناوی (واهان پاپازیان) ئەنجامدراوە. چونکە پارتی ئەرمەنی (داشناک) هاوپەیمان بووە لەگەڵ ڕێکخراوی (خۆیبوون)ی کورد، لە پێناو جودابوونەوەی کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەت لە سۆڤیەت واتە لە پێناو

سەربەخۆیی ئەرمەنستان تێ دەکۆشا. ئەم هاوپەیمانییەی کورد و ئەرمەن بووە هۆی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینی ئارارات کە تا (١٩٣٠) بە سەرکردایەتیی جەنەراڵ ئیحسان نووری پاشا درێژەی کێشا لە مەڵبەندەکانی شاری بەتلیسەوە تا چیاکانی ئارارات لە شاری (وان).

لەم کۆنگرەیەدا نوێنەرانی چوار ڕێکخراوی کوردی: میللەت فیر قەسی؛ کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعی کورد.؛ کۆمیتەی ئیستیقلال؛ کۆمەڵەی کورد و کوردستان، بە ئامادەبوونی (واهان پاپازیان)ی سەرۆکی ڕێکخراوی (داشناک – تاشناق)ی ئەرمەن، بەشدار بووبوون.

کورد بڕیاریان دا کە هەموو کۆمەڵە و ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکانی پێشوو هەڵبوەشێننەوە و هەموویان بڕژێنە ناو ئەم کۆمەڵە تازەیەوە؛ یەکگرتوو، لە ڕێگەی ئەم کۆمەڵەیەوە بۆ سەربەخۆیی کوردستان تێ بکۆشن. هەر لەو ساڵانەدا ڕێکخراوی (خۆیبوون) ئاڵای کوردستان دادەڕێژێت. هەر لەو سەروبەندەشدایە کە ڕێککەوتننامەیەکی گرینگ و مێژوویی لە پێناو پتەوترکردنی دۆستایەتیی ئەرمەن و کورد، هەروەها لە پێناو پێکەوەخەباتی هاوبەش لە نێوان ئەرمەن و کورددا ئیمزا دەکرێت.

١٩٢٧

پارتی تاشناقی شۆڕشگێڕ لە شۆڕشی ئاگری لە ساڵەکانی ١٩٢٧ تا ١٩٣٠ بەشدارییەکی تەواوی لەگەڵ هاوپەیمانەکەیدا (پارتی خۆیبوون) هەبوو. ئەم هاوکارییە لە بەیاننامەی کۆتاییی کۆنگرەی دووەمی پارتەکەیان جەختی لەسەر کرابووەوە کە تیایدا هاتبوو (کۆنگرە لەگەڵ شۆڕشی کوردی کە دژی تورکیا دەستیان پێ کردووە هاوسۆزە لە ڕزگاربوونی کوردەکان ، بۆیە پارتی تاشناق بەڵێن دەدا هاوکاری و پشتگیریی ئەو بزووتنەوەیە بکا بەمەرجێ لە پێناو ڕزگاربوون لەژێر چنگی تورکیا بێت).

نوێنەرەکانی پارتی تاشناق لە هەوڵی وەدەستهێنانی یارمەتییە نێودەوڵەتییەکاندا بوون، ڕۆبین پاشا کە سەرکردەیەکی تاشناق بوو هەوڵی وەدەستهێنانی پشتگیریی ئینگلتەرا و ئێرانی دەدا بۆ کوردەکانی تورکیا، لە هەوڵی پەیداکردنی چەک و تفاقی ئێران دابوو بۆ کوردەکان هەروەها ئەرمەنەکانی ئێران لە پەیداکردنی چەک و یارمەتییەکانی تر درێغییان نەدەکرد، لە ڕێگەی باشووری تەبرێزەوە بە بزووتنەوەی کوردەکانیان دەگەیاندن، چونکە پارتی تاشناق کۆگا و عەمباری زۆریان لە خوارووی قەوقاز و چەند ناوچەیەکی ئێران هەبوو تیایدا ئەم تفاق و کەرەستانەیان کۆ دەکردنەوە و ئاودیویان دەکردن، ئەمەش دەکەوتە خانەی پابەندبوون بە جێبەجێکردنی پەیماننامەکەی نێوان پارتی خۆیبوون و تاشناقەوە.

چەند کەتیبەیەکی سەربازیی ئەرمەن بۆ بەشداری و هاوکاریی شۆڕشی کوردی نێردرانە ئاگری بە سەرۆکایەتیی ئەردەشێر مرادیان وەکو پشتگیریی مادی و مەعنەویی شۆڕش. ئیحسان نووری پێشوازییەکی فەرمیی لە نوێنەری ئەرمەنەکان کرد. شۆڕشگێڕە کوردەکان ناوی ئەم سەرکردە ئەرمەنەیان نا (زیلان).

لەو شەڕانە ١٢ باڵەفڕی شەڕیی تورک دەخرێنە خوارەوە جگە لە سەدان کوشتار و زیانی ماڵیی تر. دەسەڵاتی تورک هیچی نەمابوو بیداتە بەر رووی خۆی بۆ ئەوەی خۆی لە شەرمەزاریی شکستەکان دەرباز کا ناچار پەنای بۆ ئەو هاوکارییەی ئەرمەن و کورد دەبرد کە ئەم یاخیبوونەی کوردەکان بە فیت و هاندانی ئەرمەنەکانە. بۆیە کارەکە بەم ئاستە دەگا ئەمەی لە مەحافلی دەولی و دانیشتنەکانی نێودەوڵەتی باسی لێوە دەکرد، بوونی شاند و نوێنەری ئەرمەنەکان لە ناو تەشکیلاتە کوردییەکان بەڵگە بوون بەدەست تورکەکانەوە کە ئەرمەنەکان هانی کوردەکان دەدەن بۆ یاخیبوون و ڕاپەڕینیان دژی تورک.

ئەو هەڵوێست و هاوپەیمانێتییەی ئەرمەن و کورد کاری کردبووە سەر پێوەندییەکانی کورد و رووسیا، بەهۆی ئەوەی ئەرمەنەکان زۆر بەتوندی دژایەتیی رووسیایان دەکرد بەهۆی ئەوەی هاوکاریی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمینیای دەکرد. لەبەر ئەمە ڕووسیاش روی خۆی لە کوردەکان وەرگێڕا و کەوتە پڕوپاگەندە دژی شۆڕشی کوردی بە داردەستی ئیمپریالیزمی دایە قەڵەم و بۆ دژایەتیکردنی شۆڕشی کوردیش هاوکاریی تەواوی تورکیای دەکرد ئەم دژایەتییە هەم لە رێگەی تورکیا و هەم لەرێگەی نووسین و بڵاوکراوەکانی ڕووسیا کاری لەسەر دەکرد.

بە ناڕاستەوخۆ دەسەڵاتدارانی ڕووسیا پیلانی دەستگیرکردنی (ئەردەشێر مرادیان) نوێنەری ئەرمەنەکانیان لە ئاگری دا کە بە پیلانێک بەرەو خاڵە سنوورییەکانیان کێشا و لەگەڵ هەندێک لە هەڤاڵ و پاسەوانەکانی کە کورد بوون، دەستگیریان کردن و بۆ سیبیریا دووریان خستنەوە.

١٩٢٧

لە یەکەتیی سۆڤیەت و جیۆرجیا و ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت چەند فیلمێکی سینەماییی کوردی یان لەبارەی کورد، لەناو ئەوانەدا فیلمی (زارێ)، دەرهێنانی: بێگ نەزارۆڤ کە ٧٢ دەقیقە، بێدەنگ، ڕەش و سپی، ی. دەرهێنەر: ئا. دانیەلان، بەرهەمهێنانی: ئەرمێنکینۆ، ئەکتەرەکان هەندێکیان کوردن، هەروەها کۆمەڵێک ئەکتەری ناوداری ئەرمەنستانی سۆڤیەتی وەکو: مانڤێلان، گۆلازیان، مەنووچەریان، مێژووی بەرهەمهێنان: ١٩٢٧، کاتی ڕووداوەکانی ناو فیلمەکە: ٥/ئاب/١٩١٥، شوێنی ڕووداوەکان: نێوان چیای ئەلەگەز و چیای ئاگری (سەر سنووری ئەرمەنستانی سۆڤیەت و کوردستانی تورکیا).

فیلمی (زارێ) باس لە ژیانی کۆچەرە کوردە یەزیدییەکانی سەر سنووری ئەرمەنستانی سۆڤیەت و کوردستانی تورکیا دەکا لە (١٩١٥) واتە پێش ئۆکتۆبەری (١٩١٧) کە چۆن لەلایەکەوە بەدەست ئاغاکەیانەوە (تەیموور بەگ) بە هاوقۆڵی و هاوکاریی شێخی عەشیرەتەکەیان، لەلایەکی تریشەوە بەدەست سیستەمی گەندەڵ و نامرۆڤانەی قەیسەری ڕووسیاوە دەچەوسێندرێنەوە. ئەمەش لەرێگەی گێڕانەوەی چیرۆکێک کە لە نێوان (زارێ) و (تەیموور بەگ)ی ئاغای عەشیرەتەکەیانەوە ڕوو دەدا.

١٩٢٨

دانانی ئەلفوبێی کوردی لە ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت.

- ئەرمەنییەکانی کوردستان، دەورێکی دیار و پێشڕەوانەیان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی هونەری فۆتۆ و وێنەگرتن  لە کوردستان. نووسەری (مێژووی شاری سلێمانی)، ئەکرەمی مەحموودی ساڵحە ڕەشە، لە لاپەڕە (٤٩٧)ی کتێبی ناوبراودا گەواهیی ئەوەمان بۆ دەدات کە زۆربەی هەرە زۆری یەکەمین وێنەگرەکانی سلێمانی و هەڵەبجە کە لەناو شاردا ستۆدیۆی وێنەگرتنیان بۆ یەکەمین جار لە ساڵانی (١٩٣٠)دا لە سلێمانی و لە هەڵەبجەدا کردووەتەوە، ئەرمەنی و جوولەکەکان بوون. بۆ نموونە (فانووس) و (ئەجێ)، هەردووکیان ئەرمەنی بوون، شەریک بوون، بۆ ماوەی یەک دوو ساڵ مانەوە. شوێنەکەیان (بەردەرکی سەرا) بوو، لە پێش شەڕی (٦)ی ئەیلوول.

١٩٢٩

لە ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت، کارلینێ چاچان «شیعری نوێ» بڵاو دەکاتەوە.

١٩٣٠/١/١

- ئەلفابێی لاتینی لە ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت، کە لەلایەن عەرەبی شەمۆ و مارە گۆڵێفەوە دروست کرابوو، بەشێوەیەکی رەسمی کەوتە کار. پاشان لە ١٩٤٦ گۆڕا و بووە ئەلفابێی سلاڤی.

- ڕۆژنامەی ریا تازە (یەریڤان ١٩٣٠- ١٩٣٨، ١٩٥٥ - ١٩٩٣)

- یەکەمین وێنەگرەکانی سلێمانی کە لەناو شار ستۆدیۆی وێنەگرتنیان لە ساڵانی (١٩٣٠)دا لە سلێمانی و هەڵەبجەش کردووەتەوە، ئەرمەنی و جوولەکە بوون.

- ڕادیۆی ئەرمینیای بەشی کوردی، بە هاندان و هەوڵی توێژەری کورد جاسمی جەلیل، ڕۆڵێکی باشی ئەرێنیی لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا دەگێڕا لە گەیاندنی وێنەی تەبایی و بەیەکەوەژیانی گەلانی کۆماری ئەرمینیا.

- ئەرمەنەکان لە ئەمەریکا ڕۆڵێکی باشیان گێڕا بۆ ناساندنی کێشەی کورد و ڕێخۆشکردن لە بەردەم سیاسەتوانانی کورد بۆ نواندنی کار و چالاکییەکانیان لەوێ. ئەمە کاتێک بەدی دەکرا کە واهان قارداشیان یەکێکە لە سەرکردەکانی تاشناق  و چالاکوانێکی ئەرمەن بوو لە ئەمەریکا داوەتی چالاکوانی کورد و ئەندامی پارتی خۆیبوون ئەمیر سورەیا بەدرخان دەکا بۆ ئەمەریکا چونکە ناوبراو لەو ناوچانەی ژێر ئینتدابی فەرەنساوە دوور خرابووەوە، داوەتی دەکا بۆ ئەمەریکا بۆ ئەوەی لەوێ دۆست و هەوادار و لایەنگر بۆ گەلی کورد و دۆزەکەی پەیدا بکا.

دوای ئەوەی ئەمیر سورەیا لەسەر داوەتی واهان دەگاتە ئەمەریکا هەمان ڕێچکە دەگرێتە بەر کە بۆی دیاری دەکا هەڵدەستێ بە دانانی پەرتووکێک بەناوی (کێشەی کورد لە ڕووبەڕووبوونەوەی

تورکەکاندا) بە زمانی ئینگلیزی لە فیلادلفیا، بۆ ئەوەی ڕای گشتیی ئەمەریکایی بە کێشەی کورد ئاشنا بکات.

– نوورەدین زازا لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا نووسیویەتی: لە ساڵی ١٩٣٠ بە دەست پێشخەرییەکی (مەمدوح سەلیم) و بەڕێک کەوتن لەگەڵ کۆمەڵێک کوردی مۆڵەتدار لە بواری مافپەروەری (حقوق) و زانستی سیاسیی بەڕەچەڵەک خەڵکی (وان) و هەندێک ڕووناکبیری تورکیاش، ڕێکخراوێکی سیاسییی (خۆییبوون)یان لە سووریا دروست کرد، کە ئامانجەکەی سەربەخۆییی کوردستانی تورکیا بوو، هەمان ساڵ هەندێک لە ئەندامەکانیان، بەڕێک کەوتن لەگەڵ ئەرمەن هەوڵیان دا بێنە تورکیاوە بەمەبەستی ڕێکخستنی کاری سەربازییی دژی تورکیا و توانییان (ئیحسان نووری) ئەفسەری پێشووی دەستەی ئەرکانی تورکیا بنێرنە چیاکانی ئارارات.

شای ئێران کە ململانێی سنووریی هەبوو لەگەڵ مستەفا کەمال، ڕێی دا بە ئیحسان نووری کە لە ئێران بپەڕێتەوە و لە بەشی ڕۆئاوای چیاکانی ئارارات جێگیر ببێت.

ئیحسان نووری توانی ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆکە کوردەکان لە قوربانییانی چەوساندنەوەی کەمالیزم لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە و لەوێوە زۆری نەبرد بەهەڵمەتەکانی هێزەکانی تورکیای پەرێشان کرد.

١٩٣١

یەکەم چیرۆکی تەرجەمەکراو کە بە کتێب بڵاو کرابێتەوە: سەرهاتیا جاسم. حاجی جندی و ئەمینێ عەڤداڵ لە نووسینێکی لازۆی ئەرمەنییەوە کردوویانەتە کرمانجی، بە پیتی لاتینی: یەریڤان.

– بڵاوبوونەوەی یەکەمین شیعرەکانی ئەمینی عەڤداڵ لە ئەرمەنستانی سۆڤیەت.

١٩٤٦ کتێبی (کۆماری کورد لە ساڵی ١٩٤٦دا La Republique Kurde) نووسراوی کوردناسی ناودار، ولیەم ئیگلتۆن William EAGLETON، تاکو ئێستا بەباشترین سەرچاوە دێتە ژماردن کە بە زمانێکی ئەوروپایی (بە زمانی ئینگلیزی) لەبارەی (کۆماری کوردستان لە مەهاباد ١٩٤٦) نووسرابێت.

ئەم کتێبە گرینگە، لە ساڵی ١٩٩١دا، واتە نێزیکەی ٣٠ ساڵێک دوای بڵاوبوونەوەی چاپە ئینگلیزییەکە، لەلایەن نووسەرێکی فرەنسایی، بە بنەچە ئەرمەن، بەناوی کاترین تێر- سەرکیسیان Catherine Ter SARKISSIAN تەرجەمەی زمانی فرەنسایی کراوە، لە ڕێگەی دەزگای کۆمپلێکسەوە Edition complexe لە پاریس کەوتووەتە بەر دیدی خوێندەوارانی فرەنسا و فرەنسایی زمان.

# ئەرمەن و کورد

فەرهاد پیربالْ

٢ لە ٢

## ئەدەبیات و کولتووری کورد
## لە ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەتی پێشوودا

ئەدەبیات و کولتووری کورد لە یەکەتیی سۆڤیەتی پێشوودا بە تایبەتی لە کۆماری ئەرمەنستاندا ئەگەرچی مێژوویەکی دێرینی نییە، بەڵام لە چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە توانیویەتی ناسنامەیەکی جیاکەرەوەی خۆی هەبێت و ڕۆڵێکی باش ببینێ لە بەرەوپێشەوە بردنی ئەدەبیاتی کورد.

کۆماری ئەرمەنستان (ئەرمینیا) لە ڕووی دانیشتوانەوە لەوڵاتە چڕەکان دێتە ژماردن بۆ هەر ١کیلۆمەتری چوارگۆشە ١٢٦ کەسی بەردەکەوێ، ڕێژەی سەرژمێری بەپێی سەرژمێریی ساڵی ٢٠٠١ دەگاتە ٣٣٣٦١٠٠ هاووڵاتی. ئەرمەنەکان لەم وڵاتە ڕێژەی لە ٨٨٪ پێک دەهێنن، لەگەڵیان چەند کەمە نەتەوایەتییەک دەژین: ئازەرییەکان لە ٦,١٪، رووس لە٢,٣٪ ، کورد لە ١,٥٪، هەندێکیش لە ئۆکرانی و گورجی و تورک و فارس و ئاشووری و هەندێکی تر. بە ڕێژەی لە ٩٦٪ی دانیشتوانی کۆمار بە ئەرمەنی دەدوێن لە ٢٪ بە رووسی و لە ٢٪ زمانەکانی ترن.

ئەرمینیا بەسەر ١٠ هەرێمدا دابەش دەبێ: ئاراگاتسۆتن، ئارارات، ئارماڤیر، گیگهارکونیک، کۆتایک، لۆری، شیراک، سیونیک، تاڤوش، ڤایۆتس دزور. لەگەڵ شاری یەریڤانی پایەتەخت.

کوردی ناو کۆمارەکانی یەکەتیی سۆڤیەتی پێشوو (لە ئەرمەنستان، گورجستان -جیۆرجیا-، ئازەربایجان، تورکمانستان.. هتد) بەشێوەیەکی تێکڕا ژمارەیان دەگاتە ملیۆنێک کەس.

زۆربەی مێژوونووسان ڕایان وایە کورد لە پێش سەدەی یازدەمەوە لە قەوقاس هەبوونە، لە ناوچەکانی دەوروبەری ئەرمەنستان و گورجستاندا ژیاون، واتە بەر لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەیووبییەوە کورد لە ئەرمەنستان و تورکمانستاندا دەژیان پێش ئەوەی ڕووسیا ئەرمەنستان و تورکمانستان داگیر بکا. بەڵام دواتر هەندێ کوردی تر لە ئازەربایجان و تورکیاوە ڕەویان کردە ئەرمەنستان.

لە ١٨١٣ دوای پەیمانی گوڵستان بەشێک لە جیۆرجیا و ئازەربایجان کەوتە دەست قەیسەری ڕووسیا. لە ١٩٢١ سەرتاپای قەوقاس کەوتە ژێردەستی ڕووسیا. هەموو ئەم ڕووداوانە، هەروەها چەوسانەوە و ئاوارەبوون و بەزۆرەملێ ڕاگواستنەوەی کورد وایان کرد کورد زۆرتر لە ئەرمەنستان و جیۆرجیا کۆ ببنەوە. بۆیە ئەمڕۆ دەبینین زۆرترین ژمارەی کورد لە جیۆرجیا بەتایبەتیش لە ئەرمەنستان دەژین. بەشی هەرە زۆری ئەو کوردانەی ئەرمەنستان و جیۆرجیا یەزیدین. پەنجا هەزار کوردێکش لە ئازەربایجاندا دەژین کە مافی دەربڕینی کولتووری نەتەوەیی و ئازادییان نییە.

ڕاستییەکەیشی کورد لە یەکەتیی سۆڤیەتی پێشوودا، لە چاو هەموو کۆمارەکانی تر زیاتر، بە پلەی یەکەم لە کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەتیدا نیمچە ئازادییەکی خۆیان هەبووە و مافی نووسین و بڵاوکردنەوەی بە زمانی خۆی پێ دراوە. هەر تەنیا لەوێشدا زیاتر ژیانێکی کولتووریی کوردی گەشەی کردووە.

پێوەندیی نێوان کورد و ئەرمەن تەنیا دراوسێیەتی نەبووە، هەروەها تەنیا پابەندیش نەبووە بە کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەتیەوە، بگرە نێزیکایەتییەکی کۆمەڵایەتی و کولتووری لە نێوانیاندا هەر لە کۆنەوە هەبووە: لە بەشەکانی کوردستانی تورکیا و ئێرانیشدا. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم بەملاوە، یەکێک لە سەرەتاکانی پەخشانی کوردی و دەستپێکردنی وەرگێڕان لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، وەک ئاماژەمان پێی دا، بە هۆی هاوکاریی ئەرمەنەکانەوەیە کە دەردەکەوێت.

بەم شێوەیە، پێوەندیی کورد و ئەرمەن و هاوکارییەکانی نێوانیان زۆر لە ١٩١٧ و دروستبوونی کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەت کۆنترە.

بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ لە ڕووسیا وەرچەرخانێک بوو لە ژیانی کوردەکانی ئەرمەنستانی سۆڤیەتدا، هەروەها تەکانێکی بەهێز بوو لە ڕووی پتەوترکردنی پێوەندییەکانی نێوان ئەم دوو نەتەوە هاودەرد و ئازادیخوازە. ئەرمەنەکان، کە بۆ خۆیان سەربەستیی نووسینیان لە چوارچێوەی کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەتیدا وەدەست هێنابوو، لە هەمان کاتدا، بە بڕیاری لینین، ڕێگەیان دایە کوردەکان بتوانن بە کوردی بنووسن و بخوێننەوە، بڵاوکراوە و قوتابخانەیان بە زمانی خۆیان هەبێت. بەکورتی: لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ بەملاوە، بایەخێکی فراوان، لەلایەن ئەرمەنەکانەوە، درا بە پێشکەوتنی زمان و بڵاوکردنەوەی ئەدەبیات و نووسینی کوردی لە کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەتدا.

یەکێک لە کارە باشەکانی یەکەتیی سۆڤیەت لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتیی لینیندا کردی، ئەوە

بوو کــە لە ١٩٢١ بـەمــلاوە هـەڵمــەتێکی دەست پـێ کـرد بـۆ نەهێــشــتنی نـەخــوێندەواری لـەناو کوردەکاندا: لە ١٩٢١ بەملاوە هیچ کوردێک نەما منداڵی خۆی نەنێرێتە بەر خوێندن. سەرچاوەکان دەڵێن: پێش ١٩١٧ لە ســـەدا نـۆهـەتی کـــورد نەخـــوێندەوار بوون، بـەڵام لە کــۆتـاییی ســـاڵانی سییەکانەوە هـەر هـەمـوو کورد فێری خوێندەواری بووبوون. لە ساڵانی کۆتاییی بیستـەکاندا، (٤٤) قوتابخانەی کوردی لەسەر خاکی یەکەتیی سوڤیەتدا دامەزران.

لە ساڵی ١٩٢٣، لەسـەر داخوازیی لینـین، ناوچە کوردنشـینەکان، وەک مـەڵبەندێکی سەربەخۆی سیـاسی، ئۆتۆنۆمـیی خۆی و ئیدارەیەکی ئۆتۆنۆمی پێ دەدرێت بـە ناوی (کوردسـتـانی سـوور) کە پایەتەختـەکەیشی برێتی بوو لە شـاری (لاچـین) لە ناوچـــەی Nagoron - Karabakh ، کورد خۆیان بەڕێوەیان دەبرد.

هـەرێمی ئـۆتۆنـۆمی (کــوردســـتـــانی ســـوور) بۆ مـــاوەی پێنج ســـاڵ، واتە تـا ســـاڵی ١٩٢٩ ڕۆژنامــەیەکیـشـیـان بە نـاوی (کوردسـتـانی سـوور Sovetskia kurdistan) بڵاو دەکـردەوە. بەڵام لە ١٩٢٩ بەمـلاوە، کاتێ سـتالین حـوکم دەگرێتـە دەست، بەهۆی سیاسـەتی دیکتـاتۆریانەی ستـالین لە هـەمـبەر کـەمـایەتییە نەتەوەیییـەکـان، کورد هـەرێمـە ئۆتۆنۆمـەکـەیان لێ دەسـەنـدرێتەوە، دەسـەڵات و تەنانەت مـافە کولتـوورییەکانیشیان کز و کزتر دەبێتەوە و لە هـەندێ قۆنـاغدا هـەر بەیەکـجاری، لە ســایەی ڕێژیمی ســتـالینەوە، دەسـڕێتـەوە. بە فـەرمـانی سـتـالین، هـەرێمی «کـوردسـتـانی سـوور» دەکـەوێتـە ژێر ڕکێفی بـەڕێوەبردنی جیـۆرجیـا و ئـەرمـەنستـان و ئازەربـایجـانەوە. ئیـتر وردە وردە ڕاگواستنەوەی کورد و ئازاردانی کورد دەست پێ دەکاتەوە بەتایبەتی لە کۆماری ئازەربایجاندا.

بەم شێوەیە تاقە مەنزڵگەیەک و تاقە هیـوایەک بۆ بووژانـەوەی کولتوور و ئەدەبیاتی کوردی تەنیا ئەرمەنستان مایەوە.

نووسـەری ئەرمەنیی کوردناس، هاگۆب گازاریان لازۆ، لە ساڵی ١٩٢١، لە شاری ئێـچمیـادزین (نێزیک یەریڤـان) لە ئەرمەنستـانی سـۆڤیـەتدا، ئەلفابێیەکی ئەرمەنیی بۆ زمـانی کوردی داڕشت. ئەمەشی لە کتێبێکی وێنـەداردا بە ناونیشانی (شـەمس) بڵاو کردەوە. ئەو ئەلفابێ ئەرمەنییەی ناو کـتـێبی (شـەمس) بێگومـان هـەندێ دەنگی تایبـەت بە زمـان و فـۆنەتیکی کـوردیی خـرابـووە سـەر. کتێبی شـەمس، لە ساڵی ١٩٢١ بەمـلاوە بووە بنـچینەیەک بۆ بەکـارهێنانی ئەلـفوبێی ئەرمـەنی بۆ نووسـین بە زمـانی کوردی لە ئەرمەنستـانی سـۆڤیـەتیدا. چەندان کتێب و بڵاوکراوەی پێ نووسرا و بڵاو کرایەوە؛ هـەروەهـا چەندان قـوتابخـانەی کوردیی وەک قوتابخـانەی (لازۆ) و قـوتابـخانەی (یانەی کوردان) کرانەوە. لەو قوتابخانانەدا زمانی کوردی بەو ئەلفابێ ئەرمەنییە دەخوێنرا.

دوای ئەوە، بە هـاوکاریی نووسـەری ئەرمـەن، ئۆربێللی Orbeli، لە ١٩٢٨ ئەلفابێی لاتینی جێگەی ئەو ئەلفابێ ئەرمـەنییەی گرتـەوە بۆ نووسـین بە کوردی. ئەلفوبێ لاتینییەکە، لەلایەن عەرەبی شـەمۆ و (مـارە گۆڵێف)ەوە دروست کـرابوو وردە وردە جێگەی ئەلفوبێ ئەرمـەنییـەکەی گرتەوە تاکو لە لە ١٩٣٠/١/١ بەمـلاوە بەشێـوەیەکی ڕەسمـی کـەوتە کـار.«٩٤» . ئەلفابێ لاتینییـەکە لە ئەرمـەنستـان و

جیۆرجیا بەکار دەهات، بەڵام لە کۆماری ئازەربایجان بەکارهێنانی زمان و کولتوور و نووسینی کوردی بە هیچ شێوەیەک ڕێگەی پێ نەدەدرا. لە باکۆ یەکەم کتێب بە کوردی لە ١٩٣٠ چاپ دەکرێ. لە تورکمانستان بەدرێژاییی ١٩٣٣ تا ١٩٣٦ تەنیا شەش کتێب چاپ دەکرێن بە کوردی.

کورد لە ئەرمەنستان لە هەموو کۆمارێکی تری سۆڤیەت بەختەوەر بوون: لە ١٩٢٩ بەملاوە ژمارەی کتێبی چاپکراو بەشێوەیەکی بەرچاو بەرز دەبێتەوە لە ئەرمەنستان. هەر لەو زەمانەشدا ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بە زمانی کوردی (ڕیا تازە ١٩٣٠ــ ١٩٣٨ و ١٩٥٥ ــ ١٩٩٣)، زمانحاڵی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستان، لە یەریڤان دەورێکی باشی لە بووژاندنەوەی ڕۆژنامەوانی و وەرگێڕان و ئەدەبیاتی کوردیدا بینیوە.

پێشتریش واتە لە ساڵی ١٩٢٧ هەر لە ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت، فیلمێکی کوردی بە ناوی (زارێ)، دەرهێنانی: بێگ نەزارۆڤ، کە (٧٢) دەقیقەیە، بێدەنگ، ڕەش و سپی، لەلایەن (ئەرمێنکینۆ) بەرهەم دەهێندرێ؛ باس لە ژیانی کۆچەرە کوردە یەزیدییەکانی سەر سنووری ئەرمەنستانی سۆڤیەت و کوردستانی تورکیای ساڵی (١٩١٥) دەکا. لە ماوەی دوو ساڵدا ١٩٣١ ــ ١٩٣٢ لە کۆماری ئەرمەنستاندا زیاتر لە نۆ کتێب، لە ڕووسی و ئەرمەنییەوە، کرانە کوردی. لە هەمان کاتدا دەبینین لە ساڵی ١٩٣٢– ١٩٣٣ لە ئەرمەنستان چل قوتابخانەی کوردی هەبوون کە ٧١ مامۆستای کورد و ١٩٣٦ قوتابیان هەبوو. درەنگتر پەیمانگەیەکی مامۆستایانیشی لێ کرایەوە. ئنجا لە ١٩٣٢ لقێکی نووسەرانی کورد لەناو یەکەتیی نووسەرانی ئەرمەنستان بۆ نووسەرانی کورد دامەزرا، کە یەکەمین بەرهەمی چاپکراویان برێتی بوو لە ڕۆمانەکەی (عەرەبی شەمۆ) بە ناونیشانی (شڤانی کورد). دوای ئەویش کتێبێکی ٦٦٤ لاپەڕەییان لەبارەی فۆلکلۆری کورد بڵاو کردەوە. ڕاستییەکەیشی ماوەی ١٩٣٢– ١٩٣٨ سەردەمێکی زێڕین بوو بۆ پێشکەوتنی کولتووری کورد لە ئەرمەنستانی سۆڤیەتیدا. هەر لە ساڵی ١٩٣٤یشدا بوو لە یەریڤان کۆنگرەیەک بۆ نووسەرانی کورد لەبارەی نووسین بەکوردی و ئەدەبیاتی کوردی ساز درا. لە ماوەی ١٩٣٧دا بەرنامەیەکی ڕادیۆییش بە زمانی کوردی وەشان دەکرا. ئەمە جگە لە بەرهەمهێنانی چەندان فیلم بە زمانی کوردی.

بەڵام لە ١٩٣٨ بەملاوە، واتە لەگەڵ سەرەتای شەڕی دووەمی جیهانیدا بایەخدان بە زمان و کولتووری کورد دایە کزی و پاشان نەما. ڕۆژنامەی (ڕیا تازە)ش داخرا. چاپکردنی کتێبیش بە کوردی نەما. ئەمە جگە لە سیاسەتی تواندنەوەی زمان و کولتووری کورد لەلایەن کۆمارەکانی یەکەتیی سۆڤیەتەوە لە ماوەی ساڵانی ١٩٤٤– ١٩٤٥دا. بۆیەش دەبینین لەو ساڵانەدا ئەلفابێی لاتینی بۆ زمانی کوردی نامێنێ و ئەلفابێی سیریلیک Cyriliques کە ئەلفابێی ڕووسییە جێگەی دەگرێتەوە. هەندێ لە نووسەرانی کوردیش، لەوانە عەرەبی شەمۆ، بە فەرمانی ستالین نەفی دەکرێن و ڕادەگوێزرێنەوە.

دوای مردنی ستالین لە ١٩٥٦ دۆخ دیسان باش دەبێتەوە و چاپکردنی کتێب بە کوردی دەست

پێ دەکاتەوە. بەرنامە کوردییەکەی ڕادیۆ و ڕۆژنامەی (ڕیا تازە)ش دەست پێ دەکاتەوە. مۆسیقا و نیگارکێشـان و بەتایبەتیش شانۆ بە کوردی دەبووژێنەوە بەتایبـەتی لە ئەرمەنستان و جیـۆرجیا. لە ١٩٦١ زیاتر لە ١٣٠ کـوردی سـۆڤـیـەت لـە زانکۆکـانی مـۆسکۆ و یـەریڤـان و لینینگراد و باکـۆ دەیانخوێند.

لەو مـاوە کورتەی باسـمان کرد، دەیان ئەکادیمی، ڕۆژنامەنووس، هـونەرمەند و نووسـەری باشـی کورد لـە کۆمارەکانی یەکەتیی سۆڤیەتی پێشوودا، بەتایبـەتی لە کۆمـاری ئەرمەنسـتاندا، سـەریان هەڵداوە و لـە ئاسـتـی کوردسـتـانی گـەورەدا شـۆرەتیـان پەیدا کـردووە: مـیکائیلی ڕەشـیـد کـە لە ١٩٢٥بەمـلاوە شـیـعری نوێ بڵاو دەکاتەوە، کارلینێ چاچان لە ١٩٢٩، ئەمینی عـەڤـداڵ لە ١٩٣٢، ئنجـا لە ١٩٣٤ بەمـلاوە چیـرۆکنووس جـاسـمێ جـەلیل و ڕۆمـاننووسی مـەزن (عـەرەبی شـەمـۆ)، دواتریش حـاجی جندی، وەزیری نـادری، قـاچاغێ مـوراد، مـیکائیل ڕەشـیـد، خـاتوونە هونەرمـەند جەمیلەی جەلیل، شاکرۆی خدۆ، ئۆردیخـانی جەلیل، تۆسن ڕەشـید، ئەسکەری بوویک، تا دەگاتە د. جەلیلی جەلیل.

لێـرەدا وا باشـتـرە بەشـێـوەیەکی کـرۆنیک، گـرینگتـرین بڵاوکراوە کـوردییـەکانی چوارچێـوەی کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەتی پێشوو بەرچاو بخەین:

١٩٢٥: لە ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت، میکائیلی ڕەشید شیعری نوێ بڵاو دەکاتەوە.

١٩٢٩: ڕەشید نەجیب لە ١٩٢٩ نازناوی (گۆران) دەبەخشێتە عەبدوڵڵا بەگی شاعیری نوێخواز.

– لە ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت، کارلینێ چاچان شیعری نوێی بڵاو کردووەتەوە.

١٩٣١: یەکـەم چیرۆکی تەرجـەمـەکراو بە کتێب بڵاو کرابێتـەوە: (چیـرۆکی سـەرهـاتیـا جـاسم) کە حـاجی جندی و ئەمـینی عـەڤـداڵ لە نووسـینێکی لازۆی ئەرمـەنیـیـەوە، لە ئەرمـەنیـیـەوە کردوویانەتە کوردی، بە پیتی لاتینی، یەریڤان، لە ٣٢ لاپەڕەدا.

١٩٣٢: بڵاوبوونەوەی یەکەمین شیعرەکانی ئەمینی عەڤداڵ لە ئەرمەنستاندا.

– خـاچاتریان: زمـنامـەیێ کرمـانجی، چەند داسـتـانێکی کوردەوارییـە لـەژێر ئەم ناوانەدا: حـەفت کۆسـە، مـەحمـوودێ نێچیرڤـان، عوسمـانێ پاڵەوان، ئەسـەدێ دەڤدار. بە دیالێکتی کرمانجی، بە پیتی لاتینی، لە یەریڤان لە ٣٩ لاپەڕەدا بڵاو کراوەتەوە.

١٩٣٣: حکیـات دەرحەق عیسا. ر. درامبیان، لـە نووسینێکی ( ئامـۆسـۆف)ی ڕووسـەوە کردوویە بە کرمـانجی. چەند چیرۆکێکی ئاینییـە لـەبارەی عیسـاوە. لە ٣٤ لاپـەڕەدا، سـاڵی ١٩٣٣ لە یەریڤان چاپ کراوە.

١٩٣٤: تەرجەمـەکردنی چەند چیروکێکی سۆڤیـەتی: جاسمێ جـەلیل کۆمەڵە چیرۆکێکی سۆڤیەتی ئەوسـای بە نـاونیـشـانی سـوورا سـەفـەرێ کردووەتە کوردی و لە یەریڤـان، لە ٢٤ لاپەڕەدا چاپ کراوە. وێنە بۆ چیرۆکەکان کێشراوە.

١٩٣٥: ئەمینی عەڤدالٚ: یەکەم نامیلکەی شیعری خۆی لە یەریڤان.

– نۆڤلێتی شڤانێ کورد، عەرەبی شەمۆ نووسیویەتی، لە ١٥٥ لاپەڕەدا لە یەریڤان.

– کراستاپۆر کۆلۆمبس. ڕ. درامبیان ئەم چیرۆکەی لە ئەدەبیاتی سۆڤیەتییەوە کردووەتە کوردی و لە ٣١ لاپەڕەدا لە یەریڤان. گەشتەکەی کۆلۆمبس بە وێنەوە دەگێڕێتەوە.

١٩٣٦ : شیعرەکانی وەزیری نادری لە ئەرمەنستانی سۆڤیەت.

١٩٣٧: تەرجەمەی دوو چیرۆکی رووسیی سەدەی نۆزدەم: پووشکین: عەفران و حکیات، وەرگێڕانی: ر. درامبیان، ١٣٨ لاپەڕە، یەریڤان؛ لەگەڵ تولستۆی، وەرگێڕانی: قاچاغێ موراد، ٥٨ لاپەڕە، یەریڤان.

– تەرجەمەی چوار کۆمەڵە چیرۆکی منداڵان بۆ کوردیی کرمانجی کە لە یەریڤان بڵاو کراونەتەوە. ل ٥١ ــ ٥٢.

– رۆبنسۆن، وەرگێڕانی: جەردۆی گەنجۆ، ٧٥ لاپەڕە، یەریڤان.

– تەیر و توو، وەرگێڕانی: جاسمێ جەلیل، ڕەنگاوڕەنگ، ١٦ لاپەڕە، یەریڤان.

– چیرۆکی خووەیی و خولام، وەرگێڕانی: جاسمێ جەلیل، ڕەنگاوڕەنگ، ١٢ لاپەڕە، یەریڤان.

– رۆمانی سمانتۆ و خەجێ زەری، وەرگێڕانی: جاسمی جەلیل و ر. درامبیان، ٣٢ لاپەڕە، یەریڤان.

١٩٥٤: ئەمینی عەڤدالٚ و میکائیل ڕەشید و چەند شاعیرێکی تر لە ئەرمەنستانی سۆڤیەت دیوانە شیعرێکی هاوبەش دەردەکەن ( نڤیسکارێ کورمانجا سۆڤیەتێ).

١٩٥٧: ئا. چاچان: گوڵبەهار، یەریڤان (ئەرمەنستانی سۆڤیەت).

١٩٦٣: ئەسکەری بوویک، لەدایکبووی ١٩٤١، یەکەم شیعرەکانی بڵاو دەکاتەوە.

## دۆستایەتی و کێشەی نێوان ئەرمەن و کورد لە کۆنگرەی ئاشتیدا لە پاریس ١٩١٩

دەوڵەتە ئەوروپاییەکان (فەرەنسا و ئینگلتەرا و رووسیا) بەشداریکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان لە شەڕی یەکەمی جیهانی لە تشرینی دووەمی ١٩١٤دا، بە هەل زانی بۆ ئەوەی سامانەکانی بەسەر خۆیاندا دابەش کەن. دەستیان بە نەخشەدانانی دابەشکردنی ئەو وڵاتانە کرد کە رێژیمەکانیان بۆگەن بووبوو و ماوەیەکی زۆر بوو چاکسازییان لە داوودەزگا حکوومەتییەکاندا نەکردبوو.

فەرەنسا و ئینگلتەرا دوای وەرگرتنی ڕەزامەندیی رووسیا و ئیتالیا، ڕێککەوتننامەی سایکس

بیکۆیان لە ١٩١٦ بەست، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە تورکیای ئاسیایی بەسەر پێنج ناوچەدا دابەش کەن، بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە لیوای مووسڵ (کوردستانی عێراق) و باشوری ڕۆئاوای کوردستان (عەنتاب، ماردین، هەکاری) و کلیکیایان خستە ژێر دەسەڵاتی فرەنسا، ناوچەکانی تری کوردستان و ئەرمینیای ڕۆئاوایان بە رووسیا بەخشی، بەڵام لە ئەنجامی شۆڕشی سۆشیالیستی ١٩١٧ رووسیای قەیسەری لە شەڕ دەکشێتەوە بە هۆیەوە هاوکێشەکان دەگۆڕێن لەگەڵ هەڵوێستی هەریەک لە فرەنسا و ئینگلتەرا و وڵاتە داگیرکەرەکانی تری کوردستان و ئەرمینیا، هەروەها هەڵوێستیان لە دابەشکردنەکەش گۆڕا واتە هەڵوێستەکان لە دیالۆگەوە بووە ململانێ بۆ دووبارە دەستگرتن بەسەر پاتارەکانی شەڕ.

ئەم ململانێیە لە کۆنگرەی ئاشتەوایی پاریس زیاتر لە نێوان وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان و ئەرمینیا گەڵاڵە بوو، کە لە ماوەی ١٨ تا ٢١ی دیسەمبەری ١٩١٩ لە پاریس بەسترا. زۆربەی بڕیارەکانیش لە بەرژەوەندیی وڵاتە زلهێزەکانی ئەوروپا هاتن بە تایبەتی ئینگلتەرا و فرەنسا. لەم کۆنگرەیەدا شاندی ٣٣ دەوڵەت ئامادە بووبوون لە نێوانیاندا دوو شاندی ئەرمەنی کە یەکێکیان بە سەرۆکایەتیی (ئاوادیس ئاوهانیان)ی نوێنەری پارتی تاشناق و کۆماری ئەرمەنی بوو کە دوای کشانەوەی رووسیا سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند بوو، شاندی دووەمیان بە سەرۆکایەتی (بۆدۆس نووبار باشا)ی وەزیری میسریی کۆن بوو کە نوێنەرایەتیی ئەرمینیای ڕۆئاوای دەکرد واتە ئەو پارچە ئەرمینیایەی دەکەوێتە ناو خاکی کوردستانی تورکیا. لێرەوە بوو کە کێشەی کورد لەگەڵ ئەرمەن دەستی پێ کرد، واتە کێشە لەسەر دیاریکردنی سنووری سیاسیی کوردستان و ئەرمەنستان کەوتە نێوان نووبار پاشای ئەرمەن و جەنەراڵ شەریف پاشای نوێنەری کورد.

دوای کردنەوەی کۆنگرەکە دانیان بە کۆماری ئەرمینیا نا وەکو دەوڵەتێکی سەرکەوتوو لە شەڕی یەکەمی جیهانی. هەروەها لەم کۆنگرەیەدا شاندێکی بچووکی کوردیی نافەرمی بە سەرۆکایەتیی جەنەراڵ شەریف پاشا و ئەندامێتیی چەند سیاسەتوانێکی کوردی ڕکابەری پارتی ئیتیحاد و تەرەقی بەشداری دەکەن. شەریف پاشا لەلایەن پارتی سەربەخۆی کورد و کۆمەڵەی کوردی و پارتی دیموکراتی کوردی وەکو نوێنەری کورد هەڵبژێردرابوو.

جەنەراڵ شەریف پاشا وەک سەرۆکی شاندی کوردی توانی دوو یاداشت و دوو نەخشە پێشکێش بە کۆنگرە بکات کە تیایدا داخوازییەکانی گەلی کورد و سنووری ئەو کوردستانەی داوای دەکا بخاتە ڕوو. (ناوەڕۆکی ئەم داخوازینامەیەمان لە کتێبی (جەنەراڵ شەریف پاشا) تەرجەمە و بڵاو کردووەتەوە.

لە کاتێکدا هەریەک لە کورد و ئەرمەن هەوڵی ئەوەی دا بە پشتبەستن بە پەیمانەکانی ئینگلیز بە پشتیوانیکردن لە داوا ڕەواکانیان و بنەماکانی نامەی سەرۆکی ئەمەریکا کە تایبەتە بە مافی گەلان لە چارەی خۆنووسینیان کە لە ئارتیکلی (١٢)یدا دەڵێ: (ئەو نەتەوانەی ئێستا لەژێر دەسەڵاتی تورکدان دەبێ بواری تەواویان بۆ بڕەخسێندرێ بۆ ئەوەی بە مافی ڕەوای خۆیان بگەن

لە ئازادی و سەربەخۆییدا)، بەڵام دەوڵەتە مەزنەکان کە تازە بە سەرکەوتوویی لە شەڕ وەدەرکەوتبوون، خەریکی وەدەستهێنانی پاتار و دەسکەوتی ئابووریی زیاتر بوون بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو زیانانە بکەنەوە کە لە شەڕی جیهانی لێیان کەوتبوو. کێشەی کورد و ئەرمەن و هاوپەیمانێتییەکەیان بووبووە پرسێکی دیار و بەرچاو لە کارەکانی کۆنگرە، بە گرینگیان دەزانی چارەسەرییەکی بنەڕەتیانەی بۆ بدۆزنەوە.

ئینگلتەرا کە پێشتر هەوڵی دروستبوونی دەوڵەتێکی یەکگرتوو یا چەند میرنشینێکی کوردیی دەدا، لە هەڵوێستەکەی پاشگەز دەبێتەوە. سەرەتا ئەمە ڕای بوو بەڵام دواتر فەرەنسا پرۆژەیەکی چارەسەری کێشەی ئەرمینیا و کوردستانی پێشکێش کرد کە یەکێک لە بەندەکانی، بەم شێوەیە بوو: (کوردەکان لە توانایاندایە لەگەڵ هەریەک لە ئەرمەن و ئاشوورییەکان رێک بکەون بۆیە نابێ بیر لە دەوڵەتی کوردی بکرێتەوە بە بێ بیرکردنەوە لە دەوڵەتی ئەرمەنیی سەربەخۆ کە ئینگلیزەکانیش لەسەر ئەمە لەگەڵ فەرەنساییەکان رێک کەوتوون).

بۆ وەڵامدانەوەی پیلانگێران، بۆ دەمکوتکردنەوەی ئەوانەی لە هەوڵی نانەوەی دووبەرەکیدا بوون لە نێوان کورد و ئەرمەن، بۆ بەرپەرچدانەوەی هەوڵە نەزۆکەکانیان لە پەراوێزی کۆنگرەکەدا، رێککەوتننامەیەکی لەیەک تێگەیشتن لە نێوان شاندی کوردی و ئەرمەنی، لە نۆڤەمبەری ١٩١٩ ئیمزا کرا. لەم رێککەوتنەدا باس لە هەموو پرس و گرفتە هاوبەشەکان کرا، تەنیا پرسی سنووری نێوانیان نەبێ، ئەویشیان بۆ کۆنگرە جێ هێشت کە ئەو کاتەی لێژنەیەک بۆ ئەم مەبەستە بەڕێ دەکا ئەوسا باس لەم گرفتەش بکرێ. هەردوو سەرۆکی شاندی کوردی و ئەرمەنی بە هاوبەشی، نامەیەکیان ئاراستەی سەرۆکی فەرەنسایی( کلیمەنسۆ) کرد وەکو ئەوەی سەرۆکی کۆنگرەکەیە ئەمە ناوەڕۆکەکەیەتی:

پاریس لە ٢٠ نۆڤەمبەری ١٩١٩

جەنابی سەرۆک

دڵخۆشین بەوەی بە هاوپێچ نووسراوێکتان ئاراستە بکەین کە بۆ بەردەم کۆنگرەی ئاشتی ئاراستە کراوە و لەلایەن هەردووکمان، نوێنەری شاندی ئەرمەنی و شاندی کوردی بۆ کۆنگرەی ئاشتی ئیمزا کراوە.

خۆتان دەبینن کە بەپێچەوانەی گوتەی ناحەزانمان گوایە کورد و ئەرمەن ناتوانن بە ئاشتی بەیەکەوە بژین، ئەوەتا ئێمە لەسەر ڕۆشنایی جێبەجێبوونی ئامانجە نەتەوایەتییەکانمان، کە پێوەری چارەنووسمانە، رێککەوتنێکی ئاشتیمان ئیمزا کرد هیوادارین ریزمان قەبووڵ بکەن.

سەرۆکی شاندی کوردی بۆ کۆنگرەی ئاشتی.. شەریف پاشا

سەرۆکی شاندی نیشتمانیی ئەرمەنی.. یۆگۆس نۆبار پاشا

ئەمەی خوارەوەش دەقی ڕێککەوتنەکەیە:

شاندی کوردیی یەکگرتوو: ١٢ شەقامی سەرۆک ولسون، پاریس
شاندی ئەرمەنیی یەکگرتوو: ١٢
شەقامی سەرۆک ولسون. پاریس    پاریس ٢٠ نۆڤەمبەری ١٩١٩

جەنابی سەرۆک

ئێمە کە لە خوارەوە ئیمزامان کردووە، نوێنەری گەلی ئەرمەن و کوردین، بۆ ئێمە مایەی شەرەفە کە بە کۆنگرە رابگەیەنین، گەلەکانمان هاوبەرژەوەند و هاوئامانجن، هەست بە ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان دەکەن تا لەژێر زەبر و ستەمی عوسمانییەکان رزگاریان بێ بەتایبەتی ئەرمەنەکان، واتە لەژێر ڕکێفی ئیتیحاد و تەرەقی رزگاریان بێ، ئێمە هەموومان یەک داخوازیمان لە کۆنگرە هەیە ئەویش بە پشتبەستن بە بنەماکانی سەرۆک ولسن دان بە ئەرمینیای یەکگرتوو و کوردستانی ئازاد بنێن بە هاوکاریی دەوڵەتە مەزنەکانەوە.

لە جیاتیی کوردستان شەریف پاشا
سەرۆکی شاندی کوردی لە کۆنگرەی ئاشتی
بۆگوس نوبار  سەرۆکی کاتیی شاندی کۆماری ئەرمینیا
د. ئەوهانیانیان سەرۆکی شاندی نیشتمانیی ئەرمەنی

ئەم ڕێککەوتنە لەسەر ئەو بنەمایە پێکهاتبوو کە هیچ کام لە کورد و ئەرمەن بە هیچ شێوەیەک بەشداری لە هیچ جۆرە چالاکییەک نەکەن دژی بەرژەوەندییەکانی ئەوی تر بێ، چونکە کامەرانی و ئاسایشی هەردوو گەلی دراوسێ لە ریز لە یەکتر گرتندایە نەک لە کێشە و ململانێ.

دوای ئەوەی هێزی کەمالیستە سەربازییەکان دەبووژێتەوە کە ڕاپەڕینی کوردەکانی لە (مەلاتی) دامرکاند و دەستی بەسەر ناوچەیەکی زۆری تورکیادا گرتبوو هەوڵی پشت لێ سەندنی لەو ڕێککەوتنەی نێوان کورد و ئەرمەنی گرت ئەویش بە دەرکردنی (میساقی مللی) تیایدا جەختی لەسەر ئازادی و رزگاری و ئاشتی بۆ هەموو هەرێمەکانی زۆرینەی تورک دەکردەوە کە چارەنووسی هەموو هەرێمەکانی ئیمپراتۆریەت لە ڕێگەی ڕاپرسییەوە یەکلایی بکرێتەوە.

بە هۆی ئەوەی تورکیا و ئێران داوای ئەوەیان دەکرد کە دەست بەسەر کوردستانەوە بگرن بۆیە فرەنسا و ئینگلیز لە نێوان خۆیاندا لە ڕێگەی ئامادەکردنی ڕێککەوتنێکی ئاشتەوایی لە تورکیا ئەم وڵاتەیان دابەش کرد، هەردوو دەوڵەت بە یەکجارەکی لە کۆنگرەی سان ریمۆ لە ٢٤ی نیسانی ١٩٢٠ لە بەریتانیا لەسەر پرۆژەی کۆنگرەکە پێکهاتن کە لە کۆتاییدا کار بەوە گەیشت خەونی دامەزراندنی دەوڵەتی کورد و ئەرمەن لە ناوچەکەدا بۆ یەکجاری بسڕێتەوە و لەبار ببرێت.

ئەم بەڵگەنامانەی لێرەدا دەخرێنە بەرچاو، ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە سەرەڕای دۆستایەتیی نێوانیان، هەندێک گرژی و ئاڵۆزی لە نێوان کورد و ئەرمەنەکاندا لە ساڵی (١٩١٩) بەمەلاوە لەسەر مەسەلەی دەسنیشانکردنی سنووری (ئەرمینیا) و (کوردستان) ڕووی داوە.

## بزووتنەوەی کورد لە تۆماری ئەرمەنییەکاندا

Bulletin Armenien - 1919-1921

سەردەمی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی (١٩١٤–١٩١٨) بۆ هەموو گەلانی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست، بە عەرەب و فارس و ئەرمەن و تورک و کوردیشەوە، بە سەردەمێکی هەتابڵێی گرینگ و مێژوویی لە قەڵەم دەدرێ. بەتایبەتی بۆ گەلی کوردی ژێر دەست، کە وڵاتەکەی، لەو سەردەمەدا بە قۆناغێکی هەژەند و ڕاچەنیوی هەتا بڵێی پڕ لە تراجیدیا و کارەساتی جۆرەوجۆر تێپەڕ دەبوو، هەر لەو سەردەمەشدا بوو، واتە لە دوای کۆتاییهاتنی شەڕی یەکەمی جیهانی، کوردستان سەرلەنوێ بە شێوەیەکی تازە دابەش کرایەوە، نەخشەیەکی سیاسیی جوگرافیی تازەی بەسەردا سەپێنرا.

گەلانی تورک، عەرەب، ئەرمەن، فارس، لەو سەردەمەدا هەریەکەیان چ لە ناوەوە چ لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆیاندا (لە ئەمەریکا، لە لەندەن، لە پاریس، لە جنێڤ...) هەریەکەیان چەندان بولتەن و تۆمار و بڵاوکراوەی تایبەتی نەتەوەیی خۆیان هەبووە، هەموو دەنگوباس و دۆکیومێنیت و راستییە مێژووییەکانیان لەبارەی جموجۆڵی کولتووری و سیاسیی وڵاتەکەی خۆیان لەو تۆمارانەدا پاراستوون، کەچی گەلی کورد، بە پێچەوانەی ئەو میللەتانە، لە چەند ڕۆژنامەیەکی پەرپووت بەملاوە کە لەو سەردەمەدا تاک و تووک لەژێر سانسۆری ئەو دەوڵەتانەدا دەریان کردوون – کە ئەوانیش ئەمڕۆ نوسخەکانیان زۆر بەدەگمەن دەست دەکەون – هیچ تۆمار و بڵاوکراوەیەکی سەربەخۆی ئەوتۆی نەبووە کە ئەمڕۆ مێژوونووس وتۆژەرەوەی کورد بتوانێ بۆ لێکۆڵینەوەی ژیانی کولتووری و سیاسیی ئەو سەردەمەی گەلی کورد پشتیان ببەستێ.[1]

یەکێک لە سەرچاوە گرینگ و بایەخدارەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە بزووتنەوەی سیاسیی کورد، هەروەها بۆ ساغکردنەوەی ژیانی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیی گەلی کورد لەو سەردەمەدا، تۆمار و بوڵتەن و بڵاوکراوەی گەلە دراوسێکانی کوردن، بەتایبەتی تۆمار و بڵاوکراوە ئەرمەنی و تورکییەکان، لەبەرئەوەی ئەم دوو میللەتە لەو سەردەمەدا پێوەندییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی ڕاستەوخۆیان بە میللەتی کورد هەبووە، لێرەوە، فێربوونی زمانی ئەرمەنی و وەرگێڕان لە زمانی ئەرمەنییەوە، خزمەتێکی گەورە بە مێژووی نەتەوەکەمان دەگەیەنێت.[2]

تۆماری ئەرمەنییەکان Bulletin Armenien کە تۆمارێکی سیاسی– کۆمەڵایەتیی ئەرمەنییەکان بووە و بە شێوەی کۆوار، چەند جارێک لە ماوەی ساڵانی ١٩١٩–١٩٢٤ لە پاریس بە زمانی فرەنسایی بڵاو کراوەتەوە، بە یەکێک لەو سەرچاوە هەرە گرینگانە دەژمێردرێت، کە تۆژەری کورد بتوانێ زانیاری و بەڵگە و راستییە مێژووییەکان لەبارەی ژیان و بزووتنەوەی گەلی کوردەوە لەو سەردەمەدا هەڵبهێنجێنێ.

لاپەڕە درەوشاوەکانی ئەم تۆمارە ئەرمەنییە Bulletin Armenien چەند تیشکێکی تازە لە دیدێکی ئەرمەنییەوە، واتە لە گۆشەنیگایەکی تایبەتی ئەرمەنییەوە دەخەنە سەر ژیانی تاریکی بزووتنەوەی

سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووریی گەلی کورد لەو سەردەمەدا.

لێرەدا هەوڵ دەدەین بەشێک لەو دۆکیومێنتە دانسقەیە لە زمانی فرەنساییەوە وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی، بە هیوای ئەوەی سوودی خۆی بگەیەنێ.

پێویستە پەنجەنومای ئەوە بکەین، کە ئەرمەنییەکان لە هەموو دۆکیومێنت و سەرچاوەکانی ئەو سەردەمەیاندا، بە شێوەیەکی زۆر فراوان، زۆر بریندارا‌ن، ناوەڕۆکی کارەساتی قەتڵوعامەکەی خۆیان بە دەستی کوردە بەکرێگیراوەکانی سوڵتان عەبدولحەمید دووپات دەکەنەوە، بۆیە لێرەدا لەم وەرگێڕانەدا– خۆمان لە وەرگێڕانی پەرەگرافەکانی ئەم مەسەلەیە بە دوور راگرتووە، هەوڵمان داوە زیاتر ئەو بەشە سوودگەیێنانە وەربگرین کە لە شوێنی تردا باس نەکراون.

## تورکەکان لە ئەرمەنستاندا پلان دەنێنەوە

بەپێی تازەترین هەواڵەکان، کە لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە پێمان گەیشتوون، کوردەکان لەسەر داخوازیی سەرکردەکانی «تورکە لاوەکان» لەم ماوەیەدا لەسەر سنووری وڵاتی فارس و قەوقازدا لە جموجۆڵێکی زۆر گەرم و بەتاوداان بۆ چوونە ناو ئەرمەنستانەوە[٣]. ئامانجی ئەم کۆچکردنە ئەوەیە کە ژمارەی کوردەکان لەسەر خاکی ئەرمەنستاندا زیاد بکرێت، ئامانجێکی تریش ئەوەیە کە زەحمەتی و ئەستەم بخرێتە بەردەم ئەو ئەرمەنیانەی کە ئەمڕۆ لە وڵاتی فارس و قەوقازدا پەناهەندەن و دەیانەوێ بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان (...)

ئەم پلانە گڵاوە هەڵبەتا بە مشووری کۆمیتەی تورکە لاوەکانەوە بەڕێوە دەبرێت، کە لە ناوچەکانی باشووردا دەسەڵاتیان یەکجار زۆر دەڕوا (...)

دوو سەرۆک عەشیرەتی کورد سەرتۆپی ئەم جموجۆڵەن: (محەمەد سدقی ئاغا) و (سەید تەها) کە جڵەوی عەشیرەتەکانیان بە دەستەوە گرتووە و زۆریان لێ دەکەن کە بچنە ئەرمەنستان، لەوێ ژیان بەسەر ببەن. عەشیرەتی جەلالییەکان، کە ژمارەیان (١٠٠٠) خێزانێکە و لە ناوچەکانی وڵاتی فارسەوە هاتوون، هەر لە ئێستاوە هاتوون لە هەندێ گوندە ئەرمەنییە چۆڵکراوەکانی قەراغ شاری وان بنکە و بارگەی خۆیان هەڵخستووە.

عەشیرەتی عەرووسانلی، سەر بە ناوچەی ئالان لە وڵاتی فارس، کە لەژێر دەسەڵاتی خانی ماکۆ، بنەوباگەی خۆیان هێناوەتە گوندەکانی ناوچەی ئارژاک و قەرەکۆنیس لە دەوروبەری شاری (وان)دا.

سمکۆ، سەرۆک عەشیرەتێکی ٣٠ ساڵی، کە بەدرێژاییی ماوەی (١٩١٤–١٩١٨) قەتڵوعامی ئەرمەنی و نەستوورییەکانی لە مەڵبەندی (دیلمان)دا بەڕێوە دەبرد، ماوەیەک بوو خۆی لە ناوچەی سەڵماسی وڵاتی فارس کشاندبووەوە، ئەمڕۆش خەریکە بە خۆی و بە (١٠٠) خێزانی عەشیرەتی گەراڵییەوە پێ دەنێتە خاکی ئەرمەنستانەوە و خۆی رێک دەخا کە بەرەو (وان) بەڕێ بکەوێ.[٤]

عەشیرەتێکی تری کورد، عوسمان بەگ، کۆنە هاوەڵی (جەودەت) «ئەو پیاوەی بە هەزاران ئەرمەنی و نەستووریی لە شاری سەرایدا لە خوێن گەوزاند» ئەمڕۆ لەلایەن ڕێژیمی تورکەکانەوە دەسەڵاتی دراوەتێ کە عەشیرەتەکەی لە شاری قۆنیاوە ڕاپێچتە ناوچەی (وان).

هەڵبەتا ڕێژیمی ئەستەمبۆڵە کە ئەم پلانە بەڕێوە دەبا، هەموو ئامرازێکی جێبەجێکردنی بۆ سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان ناردووە تا پلانەکە لە وڵاتی ئەرمەنستاندا بە ساختە زۆرتر ببێت و لە هەمان کاتدا ڕێگە لەو سەدان هەزار ئەرمەنییە ئاوارانەی وڵاتی قەوقاز بگیرێ و نەتوانن بگەڕێنەوە زێدی خۆیان.

Bulletin Armenien N.1: 15 juillet 1919 P.4. paris

## ڕێژیمی تورکیا یاسای بەرەوزانینی

## کۆچکردنی تورک و کوردەکان بەرەو ئەرمەنستان بڵاو دەکاتەوە

جموجۆڵی کۆچکردنی کورد و تورکەکان بەرەو ئەرمەنستان، بە شێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراو بەردەوامە.

گەڕانەوەی ئەرمەنییە پەراگەندەکانی وڵاتی فارس و قەوقاز بەرەو زێدی خۆیان، لەلایەن هێزە چەکدارەکانی تورکیاوە کە وێرا وێرای سنووریان گرتووە، قەدەغە کراوە (...) لەلایەکی تریشەوە، ڕێژیمی تورکیا لە پلان نانەوەی خۆی بەردەوامە بۆ کۆچ پێکردنی بە کۆمەڵی کوردەکانی ئازەربایجانی وڵاتی فارس و قەوقاز بۆ ئەوەی بێن زێدی چۆڵکراوی ئەرمەنییەکان داگیر بکەن (...)

Bulletin Armenien N.1: 15 juillet 1919 P.4. paris

## کۆچکردنی کورد و تورکەکان

بەپێی ڕۆژنامەکانی ئەستەمبۆڵ، ڕەوکردنی کورد و تورک بەرەو وڵاتی ئەرمەنیان بەشێوەیەکی زۆر توندوتیژ هەر بەردەوامە، ئەو دوو کەسەی کە بە شێوەیەکی سەرەکی ئەم کۆچ پێکردنە بەڕێوە دەبەن، بریتین لە دوو سەرۆک عەشیرەتی کورد: سدقی ئاغا و سەید تەها (...)[5]

سمکۆ سەرۆک عەشیرەتێکی ٣٠٠ خێزانییە، کە پێشتر چەندان جار قەتڵوعامی ئەرمەنی و ئاسوورییەکانی کردبوو لە مەڵبەندی دیلمانلی Dilmanliدا ئێستا بە خۆی و بە عەشیرەتی گەردانلییەوە هاتوونەتە ئەرمەنستان و بەرەو وان دەچن (...) هەموو ئەو کاروبارانە بەدەستی (جەودەت بەگ)، نوێنەری والیی شاری وان و حەیدەر بەگی هاوڕێیەوە ئەنجام دەدرێن (...)

Bulletin Armenien N.6,30 sept.: 15 juillet 1919 P.3. paris

## کورتە هەواڵ

کۆمیتە کوردییەکە Le Comite Kurde ڕای گەیاندووە کە کوردەکان هیچ پێوەندییەکیان بە هێزە ناسیونالیستەکانەوە نییە[٦]. ئەم ڕێکخراوە کوردییە دان بە مافە نەتەوەییەکانی گەلانی تر لە تورکیا ناهێنێ (...)

کوردەکان هیچ ئامانجێکی تریان نییە جگە لەوەی ڕێز لە فەرمانەکانی ڕێژیم بگرن تا ئەو ڕۆژەی کە ئیتر کۆنفرانسی ئاشتی بڕیارێک لەبارەی مەسەلەکەیانەوە دەدات (...)

Bulletin Armenien N.9 juillet 1919 P.8. paris

## کورتە هەواڵ

دەنگوباس لە دەوروبەری شارەکانی کوردستانەوە گەیشتووەتە ڕێژیمی تورکیا: ڕێژیمیان ئاگەدار کردووەتەوە کە کوردەکان ئێستا خەریکن خۆیان پڕچەک دەکەن و زۆر توندوتیژانە بەجۆش کەوتوون. ئەم هەڵسوکەوتەی کوردەکان دەسەڵاتدارانی تورکی خستووەتە مەترسییەوە.

Bulletin Armenien N.14: 30 Janv 1920 P.8. paris

***

ئەو نامەیەی کە جەنەراڵ شەریف پاشا لە ڕۆژنامەی Le matin لە ڕۆژی ٨ی مارسدا بڵاوی کردووەتەوە، هەروەها ئەو وتارەی کە لە ڕۆژنامەی Temps لە ڕۆژی ١٠ی مارسدا بڵاوی کردووەتەوە[٧]، هەردووکیان بەسەهووچوونێکی لەلایەن نووسەرەوە تێدایە کە ئێمە بە ئەرکی خۆمانی دەزانین لێرەدا نەشتەر قەڵەمێکیان بکەین.

جەنەراڵ نووسیویەتی کە لە دوای شەر ڕاوەستان لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی «وڵاتی کوردان بەتەواوەتی بووەتە نێچیرێک. هەم ڕێکخەرە سیاسییە ئەرمەنییەکان و هەم هەندێک لە هێزە هاوپەیمانەکان مرخی خۆیان لێی خۆش کردووە...».

ئەم گازاندەیە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە، ئەو وەفدە ئەرمەنییەی لە کۆنفرانسی ئاشتیدا بەناوی گەلی ئەرمەنەوە بەشداریی کردبوو. لە یاداشتنامەیەکەی خۆیدا داوای هیچ زەویوزارێکی ئەوتۆی نەکردبوو کە سەر بە «کوردستان» بێت.[٨]

ئەرمەنییەکان هەرگیز ڕێگەیان بە خۆیان نەداوە بڵێن «کوردستان تەنیا زاراوەیەکی جوگرافیاییی تازە دروستکراوە» بگرە هەموو کات دانیان بەوەدا ناوە کە نیشتمانێکی کورد بە ڕاستی لە تەنیشت ئەرمینیا بوونی هەیە، ئەو نیشتمانە چەندان سەدەیە نەتەوەیەکی لەسەر دەژی کە وەکو ئێمەی ئەرمەن لە ڕەگەزی ئارین و ئێمەش هەست دەکەین ئەو نەتەوەیە زیاتر لە ئێمەوە نێزیکن وەک لە تورک، بەڵام هێندە هەیە کە بەشێکی ئەو نیشتمانەیان- خۆ هەر بە دەستی

ئەرمەنییەکانی چاخە کۆنەکانیش ئاوەدان کراوەتەوە- ئەمڕۆ بە زۆری بە ئیسلام کراوە و بە کورد کراوە.

ئەو نیشتمانەی کوردەکان، هەر لە سەردەمی ئێگزەنەفۆنەوە کە بە کوردستان و ئەرمینیادا تێپەڕ بووبوو، بەداخەوە نەیتوانیوە پێ بەپێی شارستانیەت بڕوات، هەردەمیش لەسەر داوونەریتە کێوییە سەرەتاییەکانی خۆی ماوەتەوە. ئەرمەنییەکان، بە درێژایی سەدەی نۆزدەم، چەندان هەوڵ و کۆششیان نواندووە بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و ڕووناکبیری لە کوردستاندا، هەوڵیان داوە کە هەستی نەتەوایەتیی کوردەکان بە جۆش بهێنن و تامی کولتوور و ڕۆشنبیری لەسەر زمانیان شیرینتر بکەن. بەڵام هەموو ئەو کۆششانەی ئێمە، بەداخەوە، بەفیڕۆ چووە، چونکە داوودەزگای ڕژێمیی تورک بەردەوام کۆسپ و تەگەرەی خستووەتە نێوانمان و بەردەوام ویستوویەتی کوردەکان سەرچیغ ببات و لەناو زەلکاوی کلۆڵیی ڕۆشنبیری و ئابووریدا بیانهێڵێتەوە، ئەمەش بە تایبەتی لەژێر فەرمانڕەوایەتیی سوڵتان عەبدولحەمیددا کە چووە ژێر کلکێشەی کوردەکانەوە و دژی ئەرمەنییەکان بە گەڕی خستن (...)

(...) وەفدی ئێمە لە وەڵامدانەوەی یانەی نەتەوەییی کوردەکاندا Kurde Club National لە ئەستەمبۆڵ[9] ڕازیبوونی خۆی پێشان داوە بۆ ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەیەک لەگەڵ شەریف پاشا لە پێناو بەجێگەیاندنی داخوازییە ڕەواکانی گەلی کورد: بۆ ئەوەی گەلی کورد بتوانێت بە ئازادییەوە لەسەر خاکی نیشتمانەکەی خۆیدا خۆی پێکەوە بنێت. ئەمە شتێکی سەیرە کە شەریف پاشا هاتووە ئەرمەنییەکانی تاوانبار کردووە بەوەی گوایە بوونی گەلی کورد و نیشتمانی کوردیان پێشێل کردووە (...)[10]

(...) ئەگەر ئەنجوومەنی کۆنفرانس بڕیار بدات، وەک ئەوەی جەنەراڵ شەریف پاشا بیری لێ دەکاتەوە، کە کوردستان دابەش بکرێتە سەر دوو زۆن و هەر زۆنێک لەژێر ئینتیدایی هێزی هاوپەیمانێکدا بێت، لەو کاتەدا نابێ ئەم کارە بە زیانی ئەرمەنییەکان بشکێتەوە (...)

(...) هاوئاینبوونی کورد و تورکەکان بە هیچ شێوەیەک ڕەوایی ناداتە ئەوەی کە شەریف پاشا ئۆتۆنۆمیی کوردەکان لەژێر سەرپەرشتیی تورکیادا بە باشتر بزانێ، چونکە ئاشکرایە جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی لەم بابەتە لە «تەڵەیەک» زیاتر هیچی تر نابێ، عەرەبەکان، ئەڵمانییەکان، خەباتیان کرد بۆ سەربەخۆیی سیاسییان، واتە بۆ جیابوونەوەی تەواوی خۆیان لە دەست ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

مەسەلەی ئاین پێوەندییەکی یەکجار زۆر کەمی بە سەربەخۆیی نەتەوەیی و ئازادییەوە هەیە. خەباتی گەلی ئەرمەن خەباتێکی ئاینی نییە. بگرە تاقە ئامانجێکی ئەوەیە کە ئێمەی گەلی ئەرمەن بە سەربەخۆیی نەتەوەیی خۆمان بگەین. لە سۆنگەی هەمان شتدا، دوای ئەوەی پیرۆزبایی‌مان لە سەربەخۆیی گەلی موسڵمانەکانی وەکو ئەلبانییەکان و عەرەبەکان کرد، بە هەمان شێوە و بە دڵگەرمییەوە بە تەنگ بانگەوازی کوردەکانیشەوە چووین بۆ ئەوەی هاوکاریان بکەین ئەوانیش

سەربەخۆیی خۆیان وەدەست بێنن (...)

ئێمە وا هەست دەکەین ئەم دوو وتارەی شەریف پاشا، تەعبیر لە بیروباوەڕی ئەو نیشتمانپەروەرە کوردانە ناکات کە لە ئەستەمبۆڵ « یانەی نەتەوەییی کوردیان» لە پێناو وەدەستهێنانی سەربەخۆیی کوردستان دامەزراندووە. هەر لەبەر هەمان هۆش، ئەم نیشتمانپەروەرە کوردانەی «یانەی نەتەوەییی کورد» ڕێگەیەکی دابڕیان گرتووەتە بەر و هەر تەنیا ماوەیەکی کەم لەمەوبەر ڕەفزی ئەوەیان کردبووەوە کە لە هەڵبژاردنەکانی (ئینتخاباتی) پەرلەمانی تورکیدا بەشداری بکەن[11] ئێمە هیواداریین گەلی کورد لە ڕێگەی خەباتی جیابوونەوە و ئازادیخوازانەی خۆیدا هەر جەسوور و بەردەوام بێت.

Bulletin Armenien N.18 - 19-20, 30 Avril 1920 P.4. paris

## درکاندنی چەند نهێنییەک لەلایەن سکرتێرێکی تایبەتییەوە

لە ڕۆژنامەی ڤەرجینە لوور Vertchine Lour ئەرمەنییەوە
وەرگێڕدراوە، ڕۆژی ١٩٢٠/٢/٢٧

لە نامەیەکدا کە لە ڕۆژنامەی Alemderدا بڵاو کراوەتەوە، غالیب بەگ، سکرتێری تایبەتی شەریف پاشا ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن شەریف پاشا هاتووەتە سەر ئەوەی بچێت داخوازیی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بکات بۆ ئەوەی بەم داخوازییە تەگەرە بخاتە بەردەم داخوازییەکانی ئەرمەنییەکان، هەروەها چۆن بەمەبەستی ئەوەی کە هەنجەتی نەتوانینی خۆبەڕێوەبردنی کوردەکان پووچەڵ بکاتەوە و بتوانێ لە کۆنفرانسی ئاشتیدا لە هەمان ئاستی ئەرمەنییەکاندا خۆی بنوێنێ، توانیویەتی قەناعەت بە بۆگۆس پاشا Boghos pacha بهێنێ و ئیمزای ڕێککەوتننامەیەکی پێ بکات.

ئەم کارەی شەریف پاشا، بێگومان، بەسەرکەوتنێکی دیپلۆماسی لە قەڵەم دەدرێ (...).

غالیب بەگ، دوای ئەوەی دەڵێ کە ئەم دەسپێشخەرییە نیشتمانپەروەرییەی شەریف پاشا لە بەردەم کۆنفرانسی ئاشتیدا بە ئاشکرا ڕوونی کردەوە کە ئەو زەویوزارانەی ئەرمەنییەکان داوایان کردبوو، بە هیچ شێوەیەک سەر بە وڵاتی ئەرمەن نین، بگرە سەر بە کوردستانن؟ هەروەها شەریف پاشا چەندان نامەی ناردووە بۆ جەمعیەتی تەعالیی کورد Union Teali Kurd، بۆ سەرەک عەشیرەتە کوردەکان: پێی ڕاگەیاندوون کە ئەو هەر لە ئێستاوە ئامانجە سیاسییەکانی دەرەوەی وڵاتی کە پێی سپێردرابوون جێبەجێ کردوون، ئیدی ئێستاش– بەبیروڕای ئەو– سەرفرازیی گەلی کورد لەوەدایە کە لەگەڵ تورکیا ببن بە یەک. کوردستان پێویستە ئۆتۆنۆمییەکی ئیداری وەدەست بهێنێ، بەڵام لە ڕووی سیاسییەوە هەردەم سەر بە تورکیا بێت.

غالیب بەگ – خۆی ئەم نامەیەی گەیاندووەتە (جەمعیەتی تەعالیی کورد) لە ئەستەمبۆڵ،

ئێستاش چاوەڕێی وەڵامیان دەکات. دەڵێن گوایە ئەگەر پێشنیازەکانی شەریف پاشا پەسند نەکرێن، ئەوا شەریف پاشا ئیستقالە دەدا و چیی تر ڕازی نابێ ببێتە نوێنەری وەفدی کوردان لە کۆنفرانسی ئاشتیدا لە پاریس.

Bulletin Armenien 30 Mors, 15-30 Avril 1920,p.4

## بیروڕای چەند کوردێک

بەڕێز ئەکرەم جەمیل پاشا Djemil Pachazade Ekrem Beg، یەکێک لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی جەمعیەتی تەعالیی کورد Teali Dlemieti کە یەکێکە لە ڕێکخراوە کوردییە هەرە بەهێزەکان، ئەم ڕاگەیاندنەی خوارەوەی لە ڕۆژی ١٩٢٠/٢/١٨ داوەتە ڕۆژنامەی (جاگادامارد- Djagadamard):

- بەشی هەرە زۆری گەلی کورد، بە ورەیەکی زۆر بەرزەوە، داخوازیی جیابوونەوە و سەربەخۆیی دەکەن. تورکەکان پەیتا پەیتا چەندان تەلەگرامی ناوەخۆییان بۆ ویلایەتە کوردییەکان ناردووە، بەڵام ئەو تەلەگرامانە هیچ نرخێکیان بۆ دانەنراوە، چونکە تەلەگرامی درۆزنانەن. ئاخۆ تورکەکانی سەر بە حزبی میللی Milli ڕایان نەگەیاندبوو کە ئەرمەنییەکانیش هەر بێ پشت و پەنا لە ویلایەتەکانی ڕۆهەڵاتدا، چوونەتە پاڵ کوردەکانەوە؟!

ئەم جۆرە بانگەشەیە، درۆودەلەسەی تورکەکانن، جیهانی دەرەوە باش ئاگەداری ئەو زەبروزەنگە وەحشیگەرانەیەی تورکەکانن کە دەرهەق بە گەلی ئەرمەن و یۆنانی دەینوێنن. خۆ کوردیش هەر لەم زەبروزەنگ و چەوسانەوەیە بێبەش نەبووە.

ئێمەش وەکو ئەرمەنییەکان ڕاگوێزراوینەتەوە، قەتڵوعام کراوین. زیانەکانی ئێمە گەیشتوونەتە سەدان هەزار. بەو زیانانەی لە ماوەی جەنگیشدا لێمان کەوتوون، سەرجەمیان دەگەنە ملیۆنێک. سەبەبکاری ئەم قەسابخانەیەش هەمووی مستەفا کەمالە، سەرۆک بزووتنەوەی ناسیونالیزمی تورک.

تەڵعەت پاشا و ئەنوەر پاشا قوڕیان بۆ ئەرمەنییەکان گرتەوە، بۆ یۆنانی و ئاسوورییەکان، جەمال پاشا بۆ عەرەبەکان، مستەفا کەمالیش بۆ ئێمەی کورد.

شەریف پاشا لە سەرەتادا نوێنەری (جەمعیەتی تەعالیی کورد) بوو، واتە مەندووبی گرینگترین ڕێکخراوی سیاسیی کوردەکان. پاشان ئەم مەندووببوونەی شەریف پاشا، سەرلەنوێ لەلایەن حزبی ناسیونالیستی کورد Parti Nationl Kurde کە لەم دواییەدا ساز کراوە دووپات کرایەوە. ئێمە دەتوانین بڵێین کە پەیامەکەی شەریف پاشا سەدایەکی بەرزی دایەوە و لە کۆنگرەی نەتەوەیی کوردانداء کە پێش دوو مانگ لە شاری ماردیندا ساز کرابوو، بە هەڵوێستێکی جوامێرانە لە قەڵەم درا.

کۆنگرێسی نەتەوەییی کورد Congres Nationl Kurde ئەو کۆنگرەیەی لە شاری ماردین دا بە تەواوی دەنگ هاوڕاییی خۆیان بۆ شەریف پاشا دەربڕی و متمانەی خۆیان بە شەریف پاشا دووپات کردەوە.

لێرەدا بۆ ئەوەی بۆتانی بسەلمێنم کە ئێمە مافی ئازادی و سەربەخۆییی خۆمان هەیە، پێتانی رادەگەیەنم کە تورک بە هیچ شێوەیەک کوردیان لە خشتە نەبردووە. کوردستان – خۆی، بە خواستی خۆی، خۆی بە تورکیا گرێ داوەتەوە.

کوردەکان سەبارەت بە سوننیبوونیان بە هانای سوڵتان سەلیمی عوسمانی کەوتن و یارمەتییان دا بۆ ئەوەی سەرکەوتنی بەغدا وەدەست بهێنێ. ئیدریسی بەتلیس، یەکێک لە کوردە بەتوانا و دەسەڵاتدارەکانی ئەو سەردەمە، کاتێ لە بەغدا گەڕایەوە، بە سوڵتان سەلیمی ڕاگەیاند کە کوردەکان دەیانەوێ لەگەڵ تورکیا ببن بە یەک. ئیدی بەسترانەوەی کوردستان بە تورکیاوە هیچ گیروگرفتێکی نەهاتە سەر ڕێ.

ڕۆحی کورد پڕە لە ڕق و کینە دەرهەق بە زەبروزەنگی تورکەکان. ئەم ڕق و کینەیەش زۆر بە ئاشکرا لە گۆرانییە فۆلکلۆری و نەتەوەیییەکانماندا ڕەنگیان داوەتەوە و نیشانەی شەڕەکانی نێوان تورک و کوردن. ئەم گۆرانییانە گاڵتە بە ترسنۆکیی تورکەکان دەکەن، ئەوە نیشان دەدەن کە تورک لە ڕاوەڕووت و زەبروزەنگ و تاڵانکردنی ماڵی خەڵک زیاتر حەز لە هیچ شتێکی تر ناکەن. گۆرانییە هاوچەرخەکانیشمان، بەدکارییەکانی ڕێژیمی ئەمڕۆی تورکیا پێشان دەدەن، دەسەڵاتخوازیی والیەکان، دزی و حیزی و پۆخڵەواتەکانیان، بەزۆر سەپاندنی باج و سەرانەکانیان.

زمانی تورکی بەقەد زمانی چینی عەنتیکە و سەمەرەیە بۆ خەڵکی ڕەشۆکی کورد، جووتیارە کوردەکان بە هیچ شێوەیەک تورکی نازانن، بەتەنیا کوردی ناو شارەکان تورکی دەزانن.

***

دوای ئەو دەمەقاڵێیانەی کە لە پەرلەمانی تورکیدا کراون، سیناتۆری کورد عەبدولقادر ئەفەندی، ئەم ڕاگەیاندنەی خوارەوەی دابووە چەند ڕۆژنامەنووسێک:

«ئەرمەنییەکان لە کۆنفرانسی ئاشتیدا داوای هەر شەش ویلایەتەکەی ڕۆهەڵاتیان کردبوو. ئێمەی کوردیش بە هەمان شێوە ڕوومان لە کۆنفرانسی ئاشتی نا بۆ ئەوەی ڕوونی بکەینەوە کە ئێمەی کوردیش، لەبەرئەوەی بەشی زۆری دانیشتوانی ئەو ویلایەتانە پێک دەهێنین، داوا دەکەین وەفدێکی تایبەت بنێردرێتە ئەو ویلایەتانە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەیەکی سەرجەمگیر لەبارەی ڕێژەی دانیشتوانی کورد و ئەرمەنەوە ساز بدرێت.

(بۆگۆس نووبار پاشا) ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو وەفدە بنێردرێتە ئەو ویلایەتانە، هەروەها گفتی ئەوەی دا کە چیی تر پڕوپاگەندە دژی نەتەوەی کورد نەکات».

«لەبارەی شەریف پاشاشەوە، بێگومان ئاشکرایە کە ئەو نوێنەری جەمعیەتی تەعالیی کوردانە. ئەم جەمعیەتەش بۆ ئێمە نوێنەری هەستی نیشتمانیمانە. کەواتە، شەریف پاشا بە تەواوەتی مافی ئەوەی هەیە کە لەوێ وەک نوێنەری گەلی کورد ڕەفتار بکات». «ئێمە داوای ئۆتۆنۆمیی هەر ئەو پێنج ویلایەتەمان کردووە کە لە ڕۆهەڵاتی تورکیادا کوردیان تێدا دەژی. ئێمە خۆمان بە دەروەست دەزانین لە ئاست ئەوەی کە وڵاتەکەمان بەوە پێشەوە ببەین و هەنگاو بەرەو شارستانیەت هەڵبهێنین، ئەمەش بە هێز و توانای شەخسیەتە هەرە کارامە و بەهرەمەندەکانی نەتەوەکەمان. بێگومان تورکەکانیش دەتوانن بەشداری لە کاروبارەکانی دەسەڵاتداریتی Gouverment بکەن. بەڵام ئێمە ئەگەر بێین پشت بە لاوازیی خۆمان ببەستین و خۆمان بدەینە پاڵ ئەرمەنییەکان لە دژی تورک، ئەوا ئەم هەڵوێستە دەبێتە شێوە خیانەتکارییەکی بێ مانا و پروپووچ».

Bulletin Armenien 30 Mors, 15-30 Avril 1920,p.4-5.

پەراوێزەکانی وەرگێڕ:

٣- لە تێکستەکەدا وشەی ئەرمینیا Armenie بەکار هاتووە، کە ئەرمەنستانی تورکیا دەگرێتەوە.

٤- نەستۆرییەکان Nestoriens. مەبەستی لە ناوچەی سەڵماست لەوانەیە (شەڵماش) بێت لە کوردستانی ئێراندا.

٥- لە ژمارە (٢)ی تۆمارەکەدا هیچ شتێک لەبارەی کوردەوە بڵاو نەکراوەتەوە. لە ژمارە (٣)دا لە لاپەڕە (٢)، وتارێک باسی چاوپێکەوتنی کورد و تەتەرەکان دەکات لە کۆماری ئەرمینیادا، کە بە سەرپەرشتیی داوودەزگای تورکەکان ئەنجام دراوە. لە ژمارە (٤) و (٥)یشدا شتێکی ئەوتۆ لەبارەی کوردەوە بەدی ناکرێ.

٦- گەلی کورد لەساڵی ١٩١٩دا زیاتر لە سێ کۆمیتەی هەبووە، بەداخەوە لێرەدا پێشان نەدراوە کە باس لە کام کۆمیتەی کوردی دەکات! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لەوانەیە ئەم کۆمیتەیە (جەمعیەتی تەعالی) بێت کە سەرۆکەکەی (جەمیل پاشازادەی ئەکرەم بەگ/ Djemil Pachazade Ekrem bey) بووە چونکە بەپێی هەمان سەرچاوە، ژمارە (٢٠/١٩/١٨) ٣٠ مارس - ٣٠ ئەپریل ١٩٢٠ لاپەڕە (٤)

٧- ڕۆژنامەی Le Matin و Temps دوو ڕۆژنامەی فرەنسایین کە لە سەرەتای ساڵانی بیستەکاندا بە زمانی فرەنسایی بڵاو دەکرانەوە. جەنەراڵ شەریف پاشای کورد، بەردەوام لەم دوو ڕۆژنامەیدا وتاری لە پێناو بەنێودەوڵەتیکردنی کێشەی کورد هەروەها لەبارەی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردەوە و پێویستبوونی سەربەخۆیی کوردستان بڵاو کردووەتەوە.

ئەم وتارە جۆرەوجۆرانەی جەنەراڵ شەریف پاشا کە بە زمانی فرەنسایی لەبارەی سەربەخۆیی کوردستان لە نێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٥دا لە کۆوار و ڕۆژنامە فرەنساییەکاندا بڵاو کراونەتەوە، بایەخێکی تا بڵێی گرینگیان بۆ لێکۆڵینەوە مێژوویی و سیاسییەکان لەبارەی بزووتنەوەی ناسیونالیستی کوردەوە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا هەیە. ئێمە ئەم دوو وتارە ناوبراوە و چەند وتارێکی تریشمان کردوونەتە کوردی و لە داهاتوودا پێشچاو خوێنەرانی دەدەین. شایانی باسە، ئەم تۆمارە ئەرمەنییەی بەردەست، ڕەخنە لە بۆچوونە سیاسییەکانی دوو لەم وتارانەی شەریف پاشا دەگرێ.

٨- ئەم پەراوێزەی خوارەوە هی سەرچاوەی ئەسڵییە ئەرمەنییەکەیە. دەڵێ (هەموومان دەزانین کە سەرۆک وەفدی کوردان، شەریف پاشا، هەروەها وەفدی ئەرمەنییەکانیش، پێکەوە هەریەکە و یاداشتنامەیەکی خۆیان پێشکێش بە کۆنفرانسی ئاشتی کردبوو لە پاریس. بڵاوبوونەویی ئەم یاداشتنامەیەی شەریف پاشا هەرایەکی بێ ئەندازەی خستە ناو رۆژنامە تورکییەکانەوە. ئەو رۆژنامە تورکییانە شەریف پاشا بەکابرایەکی «هیچ» لە قەڵەم دەدەن و دەڵێن کە ئەو بە هیچ شێوەیەک نوێنەری نەتەوەی کورد نییە. هەروەها گوایە شەریف پاشا ئەو یاداشتنامەیە لەسەر داخوازیی ئەرمەنەکان پێشکێش کردووە. بۆ ئەوەی لە هەمان کاتدا ببێتە هاندەر و داخوازییەکانی ئەرمەنییەکانیش دانیان پێ دابنرێت. رۆژنامە تورکییەکان دەڵێن کە گوایە نەتەوەی کورد بە شێوەیەکی ئۆفیسیپال رای گەیاندووە کە ئاگای لە ئیمزاکردنی ئەو یاداشتنامەیە نییە و شەریف پاشا تەنیا لە پێناو بەرژەوەندییەکانی خۆی ئەم کارەی کردووە. بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ببێتە سەرۆک دەوڵەتی کوردان). بڕوانە هەمان بوڵتەنی ئەرمەنی ژمارە (١٩/١٨-٢٠) لاپەڕە (٣) رۆژی ١٩٢٠/٤/٣٠.

٩- Club National Kurde کە وەرگێڕانە کوردییەکەی دەقاودەق دەکاتە (یانەی نەتەوەییی کورد) لە ساڵی ١٩١٩-١٩٢٠دا لە ئەستەمبوڵ هەبووە. لە کۆتاییی ئەم دۆکیومێنتەدا کەسێکی تریش باسی ئەم یانە کوردییەی کردووە، بڕوانە پەراوێزی (١١) کامەیە و ناوەڕۆک و ئەندامەکانیان چۆن و کێ بوونە.

١٠- لێرە بەمەلاوە لە سێ پەرەگرافی درێژدا رەخنە لە بیروباوەڕەکانی شەریف پاشا دەگرێ کە لە رۆژنامەی Le Temos, Matin دا بڵاوی کردوونەتەوە لەبارەی مەسەلەی دیاریکردنی سنووری جوگرافیایی- سیاسی بۆ ئەو دوو دەوڵەتەی لە داهاتوودا بۆ گەلی ئەرمەن و کورد دروست دەکرێ. دەڵێ: هیچ مەڵبەندێک لە جیهاندا بەقەد مەڵبەندەکانی وان و بەتلیس ئەرمەنی نین».

١١- دیاری نەکراوە سەرۆک و ئەندامەکانی ئەم یانەیە کێ بوونە. بێگومان دەستەی نووسەرانی ئەم بۆلتەنە ئەرمەنییە ویستوویانە کە وا نیشانی رای گشتیی فرەنسایی بدەن کە گوایە ناکۆکی و ناتەبایی لە نێوان رای گشتیی خەڵکی کورد و شەریف پاشادا هەبووە. هەروەها گوایە رووناکبیرە کوردەکانی ئەندامەکانی (یانەی نەتەوەییی کورد) دژی بیروباوەڕ و هەڵوێستەکانی شەریف پاشا بوونە لە پاریس

١٢- سەرچاوەی تێکڕای بەشەکانی ئەم دۆکیومێنتە، ئەمەیە:

Bulletin Armenien, N.1(Juill, 1919 M25( Juillet 1920) paris.

## دۆستایەتی و ڕێککەوتننامەی نێوان پارتی تاشناقی ئەرمەن و پارتی خۆیبوونی کورد ١٩٢٧

لە سەدەکانی پێش سەدەی بیستەم، ئەگەر پێوەندییەکانی نێوان کورد و ئەرمەن پێوەندیی خۆڕسک بووبن یا لە ئەنجامی دۆخێکی گشتی هاتبوونە کا، ئەوا پێوەندییەکان لە ١٩١٩ و لەگەڵ گەڵاڵەبوونی بزووتنەوەی سیاسیی کوردی و بزوتنەوەی سیاسیی ئەرمەن کە رۆژ لە دوای رۆژ پێشوەچوونی بەخۆوە دەبینی، بوونە پێوەندیی سیاسیی پتەو لە نێوان پارت و کۆمەڵەکانی ئەرمەن و کورد.

پێوەندییەکی پتەوی دۆستانەی تر لە نێوان ئەرمەن و کورد برێتی بوو لەو پێوەندییەی نێوان پارتی تاشناق و پارتی یەکەتیی شۆڕشگێڕی ئەرمەنی لەگەڵ پارتی خۆیبوونی کورد، کە دوای شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران (١٩٢٥) لە ساڵی ١٩٢٧دروست بوو. ئەم پێوەندییە دۆستانەیەش لە ئەنجامی کۆمەڵێک دانیشتن و بەیەککەیشتنی نوێنەرانی گەلی ئەرمەن و کورد لە کوردستان و لە تاراوگەدا (بەتایبەت لە سووریا و لبنان) هاتە دی.

پارتی تاشناق (پارتی شۆڕشگێڕی ئەرمەن) پێشتر لە شاری بدلیس لە ١٨٩٠ ، لەسەر دەستی سێ سەرکردەی ئەرمەن دامەزرابوو کە برێتی بوون لە (کریستابور، روسدوم، زافاریان) لەژێر ناوی یەکەتیی شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان، دواتر ناوەکە گۆڕا، بووە پارتی شۆڕشگێڕی ئەرمەنی (تاشناقسوتیون). دوای کۆنگرەی یەکەمی حزب لە ١٨٩٢ لە پێناو ڕزگارکردن و سەربەخۆبوونی ئەرمینیا ڕێبازی خەباتی چەکدارییان گرتە بەر. لە بەیاننامەکەدا بەم شێوەیە هاتووە: (ئێمە ڕوو لە خەباتی چەکداری دەکەین بۆ ئەوەی لەژێر ستەم و زۆرداریی تورک رزگاریمان ببێ و بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئاشتییانە لەگەڵ گەلانی ناوچەکە بژین و ئازادیی رادەربڕین و بازرگانی فەراهەم بکەین). شان بەشانی خەباتی چەکداری، چەندان گرووپ و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕیان دروست کرد بۆ دژایەتیکردنی توندوتیژییەکانی حکوومەت کە دژی گەلانی تری پیادە دەکرد وەکو کورد و عەرەب و ئێزدی و سریانی و تورکە بێلایەنەکان.

وەکو جێبەجێکردنی ئەوەی لە بەیاننامەی دامەزراندندا هاتووە پارتی ( تاشناق) پێوەندییان بە چەندان کەسایەتی و سەرکردەی کوردەوە کرد لەوانە میر عەبدوڕەحمان بەدرخان کە سەرپەرشتی و خاوەندارێتیی رۆژنامەی کوردستانی دەکرد، هەندێک جاریش لە رۆژنامەی تاشناق وتاری بڵاو دەکردەوە لە وتارەکانیدا بانگخوازی دژایەتینەکردنی ئەرمەنەکانی دەکرد و داوای لە خەڵک دەکرد کە لەسەر حیسابی ئەرمەنەکان دۆستایەتیی تورکەکان نەکەن.

لە هەمان کاتدا هەندێک لە ڕۆشنبیر و سیاسەتوانی کورد لە سووریا و تورکیا هەوڵی یەکخستنی پارت و کۆمەڵەی کوردیان دەدا تا لە یەک رێکخراودا کۆیان بکەنەوە. مەمدووح سەلیم رۆڵی سەرەکیی لەو هەولانەدا هەبوو (چونکە دۆستایەتی و پێوەندییەکی فراوانی لەگەڵ کەسایەتیی گەلی ئەرمەندا هەبوو و ا پێشبینی دەکرا رۆڵێکی بەرچاو لەو بوارەدا بگێڕێ).

مەمدووح سەلیم لە ساڵی ١٨٨٠ لە شاری وان هاتووەتە دنیا، خەڵاتی لە ئەدەب و زمانی فەرەنسایی وەرگرتووە. لە ئەستەمبوڵ پێوەندیی باشی لەگەڵ سەرکردە کوردەکاندا هەبوو بەتایبەت خانەوادەی بەدرخان و شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و خانەوادەی بابان و ئەوانەی دوای هەرەسی شۆڕش لە ئەستەمبوڵ دەستبەسەر بوون، لە ١٩١٢ دەچێتە ریزی کۆمەڵەی هیوا و دواتر لەگەڵ هەریەک لە نەجمەدین حوسنی و کەمال فەوزی و بابانزادە عەزیز، پارتی گەلی کوردیان دامەزراند کە خۆی سکرتێرەکەی بوو. دواتر ئەم پارتە ناوەکەی گۆڕدرا بۆ پارتی دیموکراتی کوردی، هەروەها لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان و منداڵەکانی سورەیا و جەلادەت و کامیران لە ١٩٢٠

کۆمەڵەی ڕێکخستنەکانی کوردیی دامەزراند. بە هاوبەشی لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان لە ١٧ی حوزەیرانی ١٩٢٠ سوپاسنامەیەکیان بۆ سەرۆکی ئەمەریکاییی ئەوسا ولسۆن نارد تیایدا سوپاسیان کرد بۆ ئەو بڕیارەی کە دابووی سەبارەت بە مافی چارەی خۆنووسی گەلان. بەهۆی دامەزراندنی لەلایەن کۆنگرەی ئاشتیی پاریس بە ناوبژیوان بۆ دیاریکردنی سنوورەکانی نێوان کورد و ئەرمەن بەو هۆیەوە بۆ سووریا دوور دەخرێتەوە و تا کۆچی دوایی لە ١٩٧٦ لەوێ دەمێنێتەوە.

دوای ئەوەی پارتی تاشناق بە هەوڵ و تەقەلایەکانی مەمدووح سەلیم دەزانن دەستخۆشیی لێ دەکەن بۆ ئەم هەنگاوە ئەمەش لە ڕێگەی نوێنەریان لە لبنان (واهان بابازیان)ەوە پێی ڕاگەیەندرا، ئەوە بوو دوای کۆمەڵێک لە پێوەندی و دانیشتن لەگەڵ هەندێک لەو پارت و کۆمەڵانە هەندێکیان بڕیاریان دا بارەگاکانیان لە ئەستەمبۆڵەوە بۆ قاهیرە بگوازنەوە.

بەوەرگرتنی ڕەزامەندیی زۆرێک لە سەرکردە و سیاسەتوانی کورد لە تورکیا و سووریا و عێراق و تاراوگە بڕیاریان دا کۆنگرەیەکی کوردیی گشتی ببەسترێ بەناوی (کۆنگرەی نەتەوایەتیی کوردی).

بەهۆی ئەو پێوەندییەی نێوان مەمدووح سەلیم و پارتی تاشناقەوە لە لبنان و بە هەوڵ و تەقەلاکانی، توانرا کۆنگرەی نەتەوایەتیی کوردی لە ماڵی واهان بابازیان لە شاری بحمدون لە لبنان لە ١٩٢٧ ببەسترێ، دوای گفتوگۆ و دانیشتن توانرا بڕیار لەسەر دامەزراندنی پارتی خۆیبوون بدەن لە ٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٧. ئەمیر جەلادەت بەدرخانیشیان بە سەرۆکی ئەم پارتە هەڵبژارد و لێژنەیەکی ناوەندیشیان لە سێ ئەندام پێک هێنا جگە لە واهان بابازیان کە نوێنەری تاشناق بوو، لە هەمان کاتیشدا بووە ئەندامی لێژنەی ناوەندیی پارتی خۆیبوون. لەگەڵ دامەزراندنی پارتی خۆیبوون پێوەندیی باش لە نێوان ئەم پارتە و پارتی تاشناقی ئەرمەن دروست بوو، بەرهەمی ئەم پێوەندییانە هاوپەیمانییە نهێنییەکە بوو کە ناونرا بە (هاوپەیمانیی سوێندخۆری و دۆستایەتی لەگەڵ تاشناق) لە ١٩ بەند پێک هاتبوو و ٨ لە ئەندامانی سەرکردایەتیی خۆیبوون ئیمزایان لەسەر کردبوو لەگەڵ نوێنەری تاشناق لە لبنان، واهان بابازیان.

ئەم هاوپەیمانی و ڕێککەوتننامەیەی نێوان حزبی تاشناقی ئەرمەن و ڕێکخراوی خۆیبوون، لە (١٩) بەندا بە زمانی فرەنسایی نووسراوە. لێرەدا هەندێک لەو بەندانە، کە لە کتێبی (فارس عوسمان: کورد و ئەرمەن، پێوەندییە مێژووییەکان، وەرگێڕانی خالید هەرکی، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، زنجیرەی (٨١)، چاپی یەکەم/ هەولێر: ٢٠١٠.) وەرگیراوە، پێشچاو دەخەین کە یەکێکە لە گرینگترین وێستگەکانی دۆستایەتی و ڕێککەوتننامە مێژووییەکانی نێوان ئەرمەن و کورد لە ساڵی (١٩٢٧) کە هاوزەمانە لەگەڵ دامەزراندنی ڕێکخراوی (خۆیبوون)ی کورد:

(– ئەم هاوپەیمانە کە لەلایەن هەردوو لایەنی تاشناقی ئەرمەنی، واهان بابازیان، لێپرسراوی

یەکەمی تاشناق و لایەنی دووەم کە هەموو ئەندامانی لێژنەی مەرکەزیی خۆیبوون ئیمزا کراوە، کە بریتین لە:

١- عەلی رەزا ئەفەندی خەڵکی (بالو).

٢- د. شوکری سەکبان بەگ.

٣- موستەفا شاهین بەگ، سەرۆکی خێڵی بەرازی.

٤- حاجۆ ئاغا، سەرۆک خێڵی هڤیرکان.

٥- ئەمین ئاغا، سەرۆک خێڵی رمان.

٦- کەریم رۆستەم بەگ، خەڵکی سولەیمانییە.

٧- مەمدووح سەلیم، خەڵکی وان.

٨- جەلادەت عالی بەدرخان.

- هەریەکەیان دەبێ بڕوای بە داخوازییەکانی ئەوی تر بێ و دان بە سەربەخۆیی کوردستانێکی ئازاد و یەکگرتوو و ئەرمینیایەکی ئازاد و یەکگرتوو بنێت. بۆ بەرگریکردن لەو بیروڕایانە، دەبێ سوود لە هەموو دەرفەتێک وەربگیرێ هاوکارییەکانی نێوانیان بیووژێندرێنەوە.
- خەبات بکرێ بۆ ڕزگارکردنی هەردوو نیشتمانی کوردستان و ئەرمینیا بێ گوێدانە ئەوەی لە کوردستانە یا لە ئەرمینیایە، هەوڵەکان تەنیا بۆ ئازادی و سەربەخۆبوونی هەردوو وڵات بێ، دوژمنایەتییان هاوبەش بێ، سنوورەکانیش دواتر دەستنیشان بکرێن.
- هەردوو لایەنی ئیمزاکردوو لەسەر ئەم پەیماننامەیە دەبێ لە کاتی هێرشی تورکی بۆ سەر هەر لایەنێک هەردووکیان بەوپەڕی توانایانەوە بەرگری بکەن و بەرژەوەندییەکانی یەکتر لەم ڕێگەیەوە بپارێزن، واتە دوای ئەوەی لەم پەیماننامەیە دۆست و دوژمنی یەکتر دیار و دەستنیشان کران ئیتر هەر لایەک دەتوانێ دۆستایەتی لەگەڵ ئەو لایەنە بکات کە بەرژەوەندییەکانی هەردوو لایەن دەپارێزێ.
- هەردوو لایەن دەبێ پابەند بن لە بڵاوکردنەوەی بیروڕای لایەنی تر و کار بۆ جێگیربوونیان بکەن جا ئەمە چ بە ڕێگەی زارەکی یا لە ڕێگەی ڕۆژنامە و هۆکارەکانی تری راگەیاندن بێ.

- دەبێ پارتی تاشناق پەیمانی ئەوە بدات هانی سەرجەم ڕێکخستنەکانی خۆی لە ئەوروپا و سەرتاسەری دنیا بدات بۆ ئەوەی پروپاگەندەکانی تۆرانییەکان ڕیسوا بکات و بەدرۆیان بخاتەوە. ئەمەش بۆ ئەوەیە کە تاشناق ئەوە بسەلمێنێ کە پروپاگەندەی تۆرانییەکان سەبارەت بەوەی کوردەکان دەستیان لە کۆکوژییەکەی ئەرمەنەکاندا هەبووە بەدرۆ بخاتەوە و ڕیسوایان بکات.

- لەسەر پارتی تاشناقە هاوکاریی دارایی پێشکێش بە پارتی خۆیبوون بکا و بەڵێنی هاوکاریی تەقەمەنی و ئیداریش بدات.

– پارتی تاشناقی شۆڕشگێڕ پەیمانی ئەوە بدات  لە وڵاتە ئەوروپاییەکانەوە یارمەتی بۆ کوردەکان کۆ بکاتەوە بە تایبەت لەو دەوڵەتانەی کە پێوەندیی لەگەڵیان کۆکە.
– هەردوو لایەن دەبێ پێوەندییەکانی ڕێکخراوەییان پتەو و بەهێز بکەن. پارتی تاشناقیش لە بڕیارەکانی لیژنەی مەرکەزیی پارتی خۆیبوون بەشداریی پێ بکەن. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ ئەندامێکی تاشناق وەکو نوێنەری تاشناق لەناو لیژنەی مەرکەزی خۆیبوون دابندرێ.
–  چونکە تورکەکان دان بەو ناوچە ئەرمەنییانە یا کوردانە نانێن کە ئێستا ڕزگار کراون یا دواتر رزگار دەکرێن، بۆیە هەر لایەک ئازادە ئەگەر دواتر هەر جۆرە ڕێککەوتنێک لەگەڵ تورکیا ئیمزا بکات، یا هەر حکوومەتێکی تر.

## یاداشتنامەکەی جەنەراڵ شەریف پاشا لەبارەی داخوازییەکانی گەلی کوردەوە

داخوازییەکانی ئەرمەنییەکان، سەرەڕای ناواخنی  ئیمپریالیستانە، مادام ئەمڕۆ بەشێوەیەکی فەرمی دانیان پێ دانراوە، کەواتە منیش وا تێ دەگەم لە توانامدا هەبێ، بەتایبەتیش لێرە لە بەردەم کۆنفرانسی ئاشتیدا، داخوازییە ڕەواکانی نەتەوەی کورد ڕابگەیەنم.

کەوشەنەکانی کوردستانی تورکیا لە ڕووی ئەتنۆگرافییەوە بەم شێوەیە دەست پێ دەکەن: لە باکوردا زیفین، وێڕای سەر سنووری وڵاتی قەوقاز کە درێژ دەبێتەوە بەرەو ڕۆئاوا تا دەگاتە ئەرزەڕۆم، ئەرزنجان، ئەرەبگیر. لە باشووردا هەران، تەپۆلکەکانی ژەنگار، تەلەعفەر، ئەربیل، کەرکووک، سلێمانی، سنە. لە ڕۆهەڵاتیشدا بە ڕەواندز دەست پێ دەکا، باشقەڵا، وەزیر قەڵا، واتە وێڕای سنووری وڵاتی فارس تا دەگاتە چیای ئارارات .

کورد لە ڕۆژگارە هەرە دێرینەکانەوە بە ناوی جیا جیا، لە سێزدە سەدە لەمەوبەریشەوە بە ناوی کورد لەم مەڵبەندانەدا گیرساونەتەوە و بنەگربوونە[٢]. تا ئەو ڕۆژەی بە خواستی خۆیان چوونەتە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتدارێتیی سوڵتان سەلیمی یەکەمەوە. دیناوەر، هەکاری، ئامێدی، حەسەن کیف، میرداسی، شێروان، سلێمانی، سەحران، پلێنگان، بەتلیس، گارزا، بۆتان.. هەموو ئەم شارانە لەژێر دەسەڵاتی میرنشینە کوردە سەربەخۆکاندا بوونە.

مومسن Mommsen لە کتێبەکەی خۆیدا لەبارەی مێژووی ڕۆمانییەکانەوە، وڵاتی ئەرمینیای خستووەتە نێوان سەرچاوەکانی ڕووباری دیجلە و فورات و ڕووباری کوور. ئینسیکلۆپیدیای ئینگلیزیی Nuttals مەسەلەکەمان لەوە باشتریش بۆ ڕوون دەکاتەوە. وا لێرەدا دەقاودەق قسەکانی دەگوازینەوە:

(ئەرمینیا وڵاتێکە لە ڕۆئاوای ئاسیا، کەوتووەتە ڕۆئاوای دەریای قەزوینەوە. لە باکوری چیاکانی کوردستاندا دابەش کراوەتە سەر تورکیا و ڕووسیا و وڵاتی فارس. دەشتێکی شەقار شەقار پێک

دەهێنێ. ئەملا و ئەولای چەند دۆڵێکی بەپیت و پاراون کە لووتکەکانیان لە چیای ئاراراتدا قووت دەبنەوە.

ئەم راستییە بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە ئەرمەنییەکان لە حاڵەتی دەسەڵاتخستنی خۆیاندا پێویستە ڕوو لە وڵاتەکەی خۆیان بکەن، نەوەک بێن بە شێوەیەکی ناڕەوا مرخ لە مەرز و بوومی کوردان خۆش بکەن.

لەمەڕ ئەو بەشی کوردستانەی کە دەکەوێتە ویلایەتی ئەرزەڕۆمەوە، ئێمە دەتوانین پشت بە بەڵگەی جوگرافیاناسی مەزن ئێلیزێ ریکلووس E.Reclus ببەستین کە لە کتێبە گەورەکەی خۆیدا سنووره گشتییەکانی هەندێ لە هەرێمەکانی ئاسیای دیاری کردووە، کە ئەم سنوورانەش بە بۆچوونی ئەو کوردستانێکی ڕەوایان لێ پێک دێت ئەمەش سەبارەت بە زۆریی ژمارەی کورد لەو هەرێمەدا و هەروەها سەبارەت بە سنوورەکانیان[٥].

ئێمە بە ئەرکی خۆمان ناتوانین خۆمان لە بەڵگەکانی ئەم جوگرافیاناسە گەورەیە بدزینەوە، ئەمەش لە پێناو بنیاتنانی بناخەکانی پەیامی مرۆڤایەتی، لە پێناو پیادەکردنی پرەنسیپی نەتەوەکان لە بواری ئەو گۆڕانەی داهاتوو کە بەسەر نەخشەی جیهاندا دێت[٦].

«لەنێو ئەو دەشت و دۆڵانەی بە تایبەت دەوروبەری زابی گەورەدا کۆمەڵە خەڵکێک لە شێوەی چەند خێڵ و عەشیرەتێکی یەکانگیردا نەتەوەیەکی خاوەن هێزی هێندە گەورە پێک دەهێنن کە بەڕاستی بتوانن لە هەمبەر تورک و فارسەکاندا کەڵکەڵەی سازکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیان هەبێت».

فەرموون ئەمەتا یەکێک لە گەورەترین جوگرافیاناسەکان لەساڵی ١٨٨٤دا ئەمەی سەرەوەی نووسیوە. بە شێوەیەکی سروشتی چەند خەسڵەتێکی دانسقەی تریش هەن بتوانن لەم کۆنفرانسەدا وەدیار بکەون.

هیوادارین ڕێگەمان بدرێتێ پەنجەنومای ئەوەش بکەین کە لە حاڵەتێک ئەگەر مەڵبەندە کوردنشینەکانیش هەر بخرێنە سەر ئەو دەوڵەتە ئەرمەنییەی خەریکە دروست دەبێ، سەبارەت بەوەی کورد خەڵکێکی شەڕوان و هەردەم حەز لە ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوەکەیان دەکەن، ئەوا ئەو دەوڵەتە ئەرمەنییەی داهاتوو قەتاوقەت لە بشێوی و تەنگژەیەکی بەردەوام زیاتر هیچی تر بە چاوی خۆیەوە نابینێ: تەنیا مەگەر دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بە خۆیان بە لەشکرێکی گەورە بێن هێزەکانی خۆیان لەوێ ڕابخەن، کە لەو کاتەشدا ئەوانیش هەر دەکەونە بەر شاڵاوی شەڕێکی بێ ئامانەوە.

ئەرمەنییەکان بە گەزافەگۆیی کەوتوون و گەورەترین ئەرمەنستانیان دەوێت، ئەمەش لەبەرئەوەی لە سەردەمی تیگراندا – پەنجا ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح – دەوڵەتێک بە ناوی ئەرمینیاوە هەبووە، کەچی بە ئانقەست ئەو راستییە لە بیر خۆیان دەبەنەوە کە مەرز و بوومی وڵاتەکەیان خۆ بەشێوەیەکی راستەوخۆ پابەندی ئیمپراتۆریەتی رۆمانییەکانیش بوو، لە هەمان سەردەمی تیگراندا

لەلایەن پوومپی سەرلەنوێ داگیر کرایەوە.

ئەم سەرنجە ئیدی چیی تر ئەوە بە شتێکی سروشتی نازانێ کە ئەرمەن ڕێ بدەنە خۆیان ئەرمینیای گەورە بە بێشکەی شارستانیەت و نەژادی خۆیان لە قەڵەم بدەن، ئەرمەنییەکان وەک ئەوانەی داکۆکییان لێ دەکەن، دەیانەوێ داخوازییەکانیان بە ڕەوا بسەلمێنن، بۆ ئەمەش دێن پشت بەو دیاردەیە دەبەستن کە گوایە چەند هەزار ئەرمەنییەک ئەمڕۆ لە کوردستاندا دەژین.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم لاف و گەزافانە ئێمە دیسان پشت بە بەڵگە و قسەکانی نوتال Nuttals دەبەستینەوە کە دەڵێ:

ئەرمەنییەکان لە ڕۆژگارە هەرە دێرینەکانەوە هەردەم ڕەویان کردووەتە وڵاتەکانی دەوروبەری خۆیان وەک جوولەکە بەردەوام عەوداڵی پرۆژە و کاروباری بازرگانین بەشی هەرە زۆریشیان پووڵدار و خاوەن سەرمایەن. کورد هەرگیز ئەوەیان لەخۆ نەکردووەتە غەم کە ئەو ئەرمەنییانەی ئەمڕۆ لە کوردستان دەژین و هەموو کات خەریکی بازرگانین قازانج و بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەسەر خاکی وڵاتەکەی ئەوان ئەنجام دەدەن. ئیدی ئەرمەنییەکان بەم شێوەیە بە نیازی رووتاندنەوە و بەکارهێنانی کوردەکان وایان بەباش زانیوە بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە ڕوو بکەنە کوردستان.

کەواتە هەر سەبارەت بەهەمان کەڵکەڵەیە کە هەردەم واشیان بە باشتر زانیوە بێن لە شارەکاندا بژین تەنانەت هەر بە تەواوەتیش کارکردنی مەزرا و کشتوکاڵ بە یەکجاری فەرامۆش بکەن.

بۆ سەلماندنی کەمایەتیبوونی ئەم ئەرمەنییانە لە کوردستاندا دەتوانین پشت بەو گەواهییە فەرمییە هەرە تازانە ببەستین کە لەلایەن تورکیا و دەوڵەتە ئەوروپاییەکانەوە دەرچوون. یەکسەر لە دوای پەیمانی بەرلین وەفدێک بە سەرپەرشتیی جەنەراڵی ئینگلیز، بێکر پاشا و سەعید پاشای سەرۆک ئەنجوومەنی دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها بە سەرپەرشتیی یەکێک لە پیاوماقووڵە ناودارە ئەرمەنییەکان میناسە فەندی بە نیازی سەرژمێرکردنی دانیشتوان نێردرانە کوردستان[7].

لەو سەرژمێرییەدا هێندە بەسە کە تەنیا دیاربەکر بە نموونە بهێنینەوە چونکە ئەنجامەکەی، لەناو ٨٤٠٠٠٠ دانیشتواندا ٦٠٠٠٠٠ موسڵمان دەرچووبوون، ئنجا ٢٤٠٠٠٠یش مەسیحی یان جوولەکە.

لە ساڵی ١٨٩٥دا میر لوبانۆف Lubanof وەزیری کاروباری بێگانان لە رووسیا، کە هەڵبەتا زۆر دوورە لەوەی دۆستی کوردان بێت، ساغی کردەوە کە ئەرمەنییەکان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا تەنیا کەمایەتییەکی نەتەوەییی بچووک پێک دەهێنن.

لە ڕۆژی ٣ی نوڤەمبەری ساڵی ١٨٩٥دا بروانە ڕۆژنامەی (جورنال ئۆفیسیال) ڕۆژی ٤ی نوڤەمبەری ١٨٦٩، ل ١٣٥٧-١٣٥٨، وەزیری کاروباری بێگانان لە گفتۆگۆیەکدا لەبارەی مەسەلەی ئەرمینیاوە کە لەو ماوەیەدا لە خانەی وەزیرانی فەرەنسادا ساز کرابوو، ئەم بانگەوازەی ڕاگەیاند:

لە شارەکانی تورکیادا کە ئەمڕۆ تاقە گیروگرفتێکن مشتومڕیان لەسەر دەکرێ بەپێی سەرژمێرییەکانی بەدەستمان گەیشتوون، گەلی ئەرمەن ژمارەیان هەر چەندێک بێت لە کەرتێکی

زیاتر لە ١٣٪ دانیشتوانی تورکیا تێپەڕ ناکا لەلایەکی ترەوە مەرزبوومەکانیان لە ویلایەتەکانی ئاسیادا زۆر ناهاوسانە، لە هەندێ شوێندا ژمارەیان زۆرە لە هەندێ شوێنیشدا هەتا بڵێی پەرش و بڵاون. بە کورتی ئێمە هیچ هەرێمێک لە شارەکانی تورکیادا بەدی ناکەین کە ئەم میللەتە بەدبەختە بەڕاستی بەشی هەرە زۆری دانیشتوان پێک بهێنێت یان توانیبێتی مەڵبەندێک بۆ خۆی پێکەوە بنێت بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو مەڵبەندەوە بتواندرێت جۆرە ئۆتۆنۆمییەکیان بۆ ساز بکرێت.

لێرەدا بۆ ئەوەی هۆی ناڕەزاییی کورد بەتەواوەتی روون بێتەوە، ئەم چەند کۆپلەیەی خوارەوە بەنموونە دەهینینەوە کە لە نامیلکەیەکی ئامادەکراو لەلایەن سەرپەرشتکاری دەوڵەتی رووسییەوە وەرگیراون و کاتی خۆی بەشێوەیەکی نهێنی بەسەر تەنیا چەند شەخسیەتێکدا دابەش کراون. ئیدی سەنگینی و بایەخەکەی گومانی لێ ناکرێ، چونکە تەنیا لە پێناو کاروباری سەربازی و سیاسەتی رووسیادا ئامادە کراوە هەر لە سۆنگەی ئەمەشە کە ئەم نامیلکەیە هەڵوێستێکی بەتەواوەتی بێلایەنی لە هەمبەر کێشەی کورد و ئەرمەن هەیە، ئامانجی بڵاوکردنەوە و گەیاندنی کۆمەڵێک زانیاری بووە کە دەبووایە وەک نهێنییەک تەنیا لەنێو خۆیاندا بمێنێتەوە[8].

لەبارەی ویلایەتەکانی (وان) و (بەتلیس) ئەو دوو هەرێمەی کە بەقسەی ئەرمەنییەکان (هەر بە تەواوەتی ئەرمەنین) نووسەر بە ڕاشکاوییەوە دەڵێ:

لە شاری واندا ٤٦٪ کورد بەرامبەر ٢٦٪ ئەرمەن هەن. لە شاری بەتلیس ٥٥٪ کورد بەرامبەر ٣٩٪ ئەرمەنی هەن[9]. تورکەکانیش، کە سەر بەهەمان دینی کوردەکانن لەم دوو ویلایەتەدا لێرەدا نەدراونەتە پاڵ هیچ کامێکیان.

تەنیا لە شارەکانی وان و مووشدا دەبینین ژمارەی ئەرمەنییەکان کەمێک بەرز دەبێتەوە دەگاتە ژمارەی دانیشتوانی کورد لە هەرێمی بەتلیسدا: ٥٠٪ کورد بەرامبەر ٤٠٪ ئەرمەن هەن، بەڵام لە تەواوی هەرێمەکانی تردا، ژمارەی کورد چەندان قاتی ئەرمەنییەکانە. بە کورتی لە هەر هەرێمێکی بڵێی ئەرمەنییەکان تەنانەت نیوەی ژمارەی دانیشتوانیش پێک ناهێنن. کورد لە (هەکاری) ٥٩٪ ، لە (سیرت) ٦٠٪ ، لە (کەنج) ٧٩٪ی ژمارەی دانیشتوان پێک دەهێنن.

لەم هەرێمە ناوبراوانەی دواییدا کورد ژمارەیان هێندە زۆرە کە ئەرمەنییەکانی ئەو ناوچانە لە زمانی کوردی زیاتر ناتوانن بە هیچ زمانێکی تر بدوێن، تەنانەت لە هەرێمەکانی وان و بەتلیسدا، هەندێ ناوچە هەن کە زمانی ئەرمەنی تەنیا لەلایەن پیاوە دینییەکانەوە بەکار دێت و بەس.

سەدابارى دینییەکانیش لەم دوو ویلایەتەدا بەمجۆرەیە: لە هەرێمی واندا ٥٤٪ موسڵمان، ٤٣٪ مەسیحی، ٣٪ ئاینی تر هەن. لە هەرێمی هەکاری دا ٥٦٪ موسڵمان، ٤٣٪ مەسیحی، ١.٪ ئاینی تر هەن.

لە ویلایەتی بەتلیسدا تەنانەت لە هەموو هەرێمی بەتلیس دا ٦٠٪ موسڵمان بەرامبەر ٤٠٪ مەسیحی هەن. لە شاریشدا ٥١٪ موسڵمان بەرامبەر ٤٨٪ مەسیحی، هەروەها ١٪ خەڵکی سەر بە ئاینی تر هەن.

لە شاری سیرتدا ٦٥٪ موسڵمان بەرامبەر ٣٤٪ مەسیحی و١٠٪ خەڵکی سەر بە ئاینی تر هەن.
لە شاری کەنجدا ٦٩٪ موسڵمان ٢٠.٪ مەسیحی، ١.٪ خەڵکی سەر بە ئاینی تر هەن.

بەشێوەیەکی گشتی، لەناو هەموو ئەو ٣٢ قەزایەی کە ویلایەتەکانی وان و بەتلیس پێک دەهێنن، ژمارەی مەسیحییەکان تەنیا لە ٨ قەزادا دەگاتە نیوەی ژمارەی دانیشتوان، لە قەزاکانی تردا، موسڵمان هەموو کات ژمارەی هەرە زۆری دانیشتوان پێک دەهێنن[10].

هەموو ئەم سەرژمێرییە فەرمییانە خۆ لە سەردەمێکیشدا کراون کە سەرتاپای ئەوروپا لە گەرمەی ڕووداوە تراجیدییەکانی ئەرمینیادا لایەنگیریی خۆی بۆ بەرژەوەندیی ئەرمەنییەکان پێشان دەدا. ڕوون و ئاشکرا ئەوە دەسەلمێنن کە ئیتر ئەرمەنییەکان لە هیچ ناوچەیەکی سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بەشی زۆربەی دانیشتوان مەجوریت پێک ناهێنن. هەر بۆیەش هەڵبەتە ناکرێ بگوترێ کە ئەو ئەرمینییانە لە کوردستاندا (کە کوردستان بەشێکی فراوانی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گرتووەتەوە) بەشی زۆربەی دانیشتوان پێک دەهێنن.

لەلایەکی تریشەوە، بۆ دواین بەڵگە لەبارەی سەلماندنی زۆرتربوونی ژمارەی دانیشتوانی کوردەکان لەو هەرێمانەدا پێویستە بڵێم کە لەو دوو ویلایەتەی باسمان لێ کردن، لە هەمان کاتدا خەڵکێکی بێ شوماری سوارەی حەمیدیە هەن کە لە عەشیرەتە کوردەکان پێک هاتوون، عەشیرەتی حەیدەرانلی (سەرۆکەکەیان محەمەد سادق بەگ)، عەشیرەتی ئەدەمانلی (عەلی بەگ)، عەشیرەتی موکری (ئیبراهیم بەگ)، عەشیرەتی میلان (محەمەد بەگ)، عەشیرەتی شەمسیکی جیمسیکی (سادق بەگ)، عەشیرەتی جی کیە شەریف بەگ)، عەشیرەتی ئەدومانلێ (سولەیمان بەگ)، عەشیرەتی تاکووری (حوسین بەگ)، عەشیرەتی ئەرتووش (حەسەن بەگ)، عەشیرەتی ئەدەمانلی (ئوشان بەگ)، عەشیرەتی بەنیان (لوتفولا بەگ)، عەشیرەتی شەیدانلی (عومەر بەگ)، عەشیرەتی ئەلەج، هەروەها حەیدەرانلی (حاجی دەمید پاشا)، عەشیرەتی حەیدەرانلی کە شەش فەوج لە سوارەی حەمیدیە پێک دەهێنێ لە نێوان ڕۆهەڵاتی گۆمی وان و ڕۆئاوای زنجیرەی چیاکانی ئالاداردایە.

عەشیرەتێکی تریش هەر بەناوی حەیدەرانلی هەیە کە پێیان دەڵێن حەیدەرانلی ئەهەسە، لە دوندەک و مەلازگەرد و هەرجیشدا دەژین. لە مەڵبەندی مەلازگەرد ژمارەی خەڵکی سەر بەعەشیرەتی حەسنانلی زۆرترن. عەشیرەتی حەسنانلی لە دەوروبەری مەلازگەرد دەژین، پێنج فەوجی سوارەی حەمیدییەیان پێک هێناوە، سێ لەو پێنج فەوجە لە ویلایەتی بەتلیسدان.

لە مەڵبەندی هەرجیشدا کە دەکەوێتە قەراخ ڕووباری زەیلان، عەشیرەتی هیدمنالیەر دەژین. عەشیرەتی جەبدانلیش دوو فەوجی سوارەی حەمیدییە پێک دەهێنن و لە قەزای فەرتودان. هەرچی عەشیرەتەکانی تریشن، ژمارەیان لە چاو ئەوانەی سەرەوە کەمترە، هەریەکەشیان لە فەوجێک زیاتر پێک ناهێنن.

عەشیرەتی جەنلی لە قەراغی ڕۆهەڵاتی گۆمی واندا دەژین. عەشیرەتی تەکوری لە شاری

(سەرای) هەروەها لە قەزای (مەحمودییە)دا دەژین کە دەکەوێتە سەر سنووری وڵاتی فارس، عەشیرەتی میلانلی لە هەمان کەوشەندا دەژین. بەڵام هەندێک بەلای ڕۆئاواوە، عەشیرەتی موکریش بە هەمان شێوە لە هەمان ناوچەدان. عەشیرەتی ئەلبەگدان، کە دەکەوێتە ژووروی ڕووباری زاب. عەشیرەتی شەیدانلی لە قەزاکانی حەمیدییە و نورجیندا دەژین. هەروەها عەشیرەتی ئەلەج لە ناوچەی مەلازگەرد و ئەرجیشدا دەژین.

جگە لەو عەشیرەتانە عەشیرەتی تریش هەن کە بایەخیان لە پلەی دووەمدایە، هەریەک و چەند فەوجێکیان لەو هەرێمانەدا پێک هێناوە.

هەموو ئەو عەشیرەتانە، سەرەڕای هاوسازییان لە ڕووی سیستەمی بەڕێوەبردنی ناوخۆیاندا، بەڵام لەگەڵ ئەمەش نەیانتوانیوە سەرۆکەکانی خۆیان بگەیەننە باوەڕی ئەوەی کە داوای سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە حکوومەت بکەن، ئەو عەشیرەتانە، هەر بە سروشتی سەرکەشانەی خۆیانەوە، هەستی دڵبلندییەکی پتەو ڕەگاژۆی نەریتی نەتەوەییان بووە، هەموو کات حەز لە سەربەخۆیی نەتەوەیی دەکەن.

ئیتر ئەو کەمایەتییە نەتەوەییەی ئەرمەنییەکان، ئەگەر تەنانەت هێزێکی ئەورووپایشیان لە پشت بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بێهوودەیە لاف و گەزافی ئەوە لێ بدەن بتوانن ئەم گەلە شەڕوانە، کە ژمارەی دانیشتوانیان لە ئەوان زیاتریشە، بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

موژدەگارە مەسیحییەکان کە بۆ یەکەمین جار بە کەڵکەڵەی دینەوە پێیان نایە خاکی کوردستان، لە سەرەتادا بە کوردەکان دەستیان پێ کرد: بۆ ئەوەی بیانهێننە سەر ئاینی خۆیان، بەڵام کاتێ دەمودەست هەستیان کرد کە سەرکەوتنی ڕۆژەکەیان ئاستەمە؛ ئیتر بۆ درێژەدان بە کۆششی خۆیان ڕوویان کردە عەشیرەتە مەسیحییەکانی کوردستان. لەناو ئەم عەشیرەتانەشدا، ئەرمەنییە ئورثۆدۆکسەکان لە هەموو کەسێک زووتر و ئاسانتر چوونە ژێر بارەوە. تەنانەت هێندەی پێ نەچوو کە قوتابخانەی ئەو موژدەگارە مەسیحییانە پڕ کران لە قوتابییە ئەرمەنییەکان.

موژدەکارەکان بە نیازی ئەوەی کە هەست و نەستی بەرزەفڕانەی ئەرمەنییەکان بوروووژێنن هاتن مێژووی تیگران و هەروەها لێکۆڵینەوە لە شەڕوشۆڕەکانی تیگران و ئیمپراتۆریەتە کۆنەکەیان کردە بابەتی قسەکانی خۆیان.

لە ئاکامی ئەم پەروەردەکارییە لێوانلێوەی هەستی نیشتمانپەروەری، بۆ یەکەمین جار بیری (سەربەخۆخوازی) لەلای ئەرمەنییەکاندا سەرهەڵدەدا. هەڵبەتە بێ ئەوەی ئێمە توانیبێتمان پێشبینیی بایەخ و سەرەنجامەکانی ئەم دیاردەیە بکەین.

لەبارەی موژدەگارەکانەوە دیسان پەنا دەبەمەوە بەر نامیلکە رووسییەکەی پێشتر ئاماژەم پێ دابوو L Etat Majeur و ئەم ڕستانەی لێ دەگوازمەوە:

(لە ویلایەتەکانی واندا، موژدەکارە کاتۆلیک و پرۆتستانتەکان، لە سی ساڵ لەمەوپێشەوە ڕەگ

و ڕیشەی خۆیان لە مەڵبەندە گرینگەکاندا، هەروەها لە ناوچەرگەی هەردوو شاری وان و بەتلیسدا دامەزراندووە. لەناو ئەوانەدا، ئەرمەنییەکان لە پێش هەموو کەسێکەوەن کە پروپاگەندەی ئاینی دەکەن و بە هانای هەزارانەوە دەچن، بێ ئەوەی گوێش بدەنە نەژاد و دینی ئەو هەزارانە، هەروەها قوتابخانەکانیشیان لە ڕووی ڕێکخستنەوە لە هەرە باشترین قوتابخانەکانن. لە قوتابخانەی موژدەگارەکانی شاری وان و بەتلیسدا، هەندێ لقی پیشەوەری کراونەتەوە کە پیشە جۆرەوجۆرەکان لەو قوتابخانانەدا بە دەرس دەگوترێنەوە.

شایانی سەرنجە، ئەو خوێندنگە ئەمەریکاییانەی کە خوێندکارە ئەرمەنییەکان روویان تێ دەکەن، پێش هەموو کەسێک باربووی ئەو خوێندکارانە دەکەن کە شۆڕشگێڕی هەرە شارەزا و کارامەی دنیان بۆ پروپاگەندە و بانگەشەکردن. ئامەریکاییەکان ,سەرەڕای ئەوەی کە چەندەی پێیان بکرێ پارە و سامانی خۆیان لەو ئەرمەنییانە خەرج دەکەن، بەڵام ئەرمەنییەکان خۆشیان ناوێن.

ئەرمەنییەکان کە هەر بەشێوەیەکی زگماک چاوبرسیتییەکی بازرگانییانە پاڵیان پێوە دەنێ هەردەم لە بەشی خۆیان زیاتر داوا بکەن، ئەمڕۆ هاتوون زور لەوە زیاتریان داوا کردووە کە یاسا بتوانێت جێبەجێی بکات. لەوە دەچێ ئیمپراتۆریەتەکەی جارانیان بەلاوە زۆر بچوک بێت، حەز دەکەن بەشێکی فراوانی کوردستانیش کە ئەمڕۆ وەبەر ئاسیای بچووک کەوتووە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، ئەمەش بە یادی ئەو سەرکەوتنە ڕاگوزارییەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان پاڵەوانە ناودارەکەیان، تیگران، لە مێژووی نەتەوەییاندا وەدەستی هێنابوو.

دەوڵەتی عوسمانی، کە ئەوروپا (لە ڕێگەی دەست تێوەخستنی کاروباری ناوەخۆیی ڕێژیمی حەمیدەوە) بەردەوام پاڵەپەستۆی خستووەتە سەر، ئەوەی بە پێویست زانی کە ڕێگە بداتە ئەرمەنییە نارازییەکان، ئەگەر بیانەوێ وڵاتەکەی خۆیان بەجێ بێڵن یان واز لە ڕەگەزنامەی عوسمانیی خۆیان بهێنن. ئیتر لە ئەنجامی ئەوەدا هەزاران ئەرمەن سەری خۆیان هەلگرت و ڕەویان کرد بەرەو مەڵبەندەکانی ئیمپراتۆریەتە کۆنەکەی جارانیان، ئەو مەڵبەندانەی کە بەپێی بەندەکانی (کۆنگرەی بەرلین) خرابوونە سەر ئیمپراتۆریەتی قەیسەرەوە.

وەک دەردەکەوێ، بەشی هەرە زۆری ئەو ئەرمەنییە ڕەوکردووانە عەردەکانی خۆیان بە کوردەکان فرۆشت. هەروەها بەشێکی تریش لەو ئەرمەنییانە هەر لە خۆیانەوە زەویوزارەکانی خۆیان بەجێ هێشت.

بەپێی قانوونی عوسمانی، هەر پارچە عەردێکی بەیار(تۆونەکراو) ئەگەر تا سێ ساڵان لەلایەن زەویدارەوە کاری تێدا نەکرێت، ئەوا زەویدارێکی تر بۆی هەیە دەست بە سەر ئەو پارچە زەوییەدا بگرێت، یانیش لەلایەن دەوڵەتەوە بفرۆشیت. ئیتر ئەو زەویوزارانەی ئەرمەنییەکان بەجێیان هێشتبوو، بەم شێوەیە فرۆشرایە کوردەکان.

دوای ڕاگەیاندنی ڕێژیمی دەستووری (مەشرووتیەت ١٩٠٨) ئەو ئەرمەنییانەی بەرەو رووسیا

پەراگەندە بووبوون، سەبارەت بەوەی ڕێژیمی قەیسەر رووسیایان لە چاو ڕێژیمی تورکیا کوشندەتر و سەختتریش بۆ دەرکەوتبوو، هاتن روویان کردە ئەمنیستی گشتی، کەوتنە دەست و پەل کوتانی ئەوەی کە مەرزوبوومی زێدی خۆیان بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، بۆ ئەمەش هاتن داوایان لە دەوڵەت کرد بۆ ئەوەی ئەو زەویوزارانەی بە ناهەق کەوتبوونە دەست زەویدارە تازە کوردەکان بدرێنەوە خۆیان.

ڕێژیم کە بەردەوام لەژێر زەبری داخوازیی زێدەڕۆکانی دیپلۆماسیە ئەوروپاییەکاندا بوو، ناچار کرا دەست لەو زەویوزارانە بکشێنێتەوە، بەڵام کوردەکان کە لە دەست ئەم ستەمە کەللەیی بووبوون، بە هەموو توانای خۆیان ڕووبەڕووی ئەم تەرزە رەفتارە وەستانەوە. کاتێ شەڕی جیهانی دەستی پێ کرد، کۆمیسیۆنێکی ئەوروپایی تایبەت بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە و ناتەباییە، چووە ئاسیای بچووک و کوردستان.

هەموو ئەو شتانە بە ئاشکرا ئەوە دەسەلمێنن کە بەشی هەرە زۆری ئەو ئەرمەنییانەی لە کوردستان ژیان بەسەر دەبەن، بە خواستی خۆیان ئەو وڵاتەیان جێ هێشتووە .کەواتە لە ڕووی یاساوە چیی تر مافی ئەوەیان نییە داوای ئەو هەرێمانە بکەنەوە.

ئەگەر زۆربەی نەتەوەیەک نەیتوانیبێ کەمایەتییەکی نەتەوەیی بەشێوەیەک بەڕێوە ببات کە ئەو کەمایەتییە نەتەوەییە پێی رازی بێت، ئاخۆ ئەمە بە شتیکی رەوا دەزانرێت کە ئەمڕۆ ئەو کەمایەتییە نەتەوەییە ڕێگەی پێ بدرێت بەڕێوەبردنی نەژادێکی وەکو نەژادی کورد کە ژمارەیان زۆر لە ئەوانیش زیاترە و هەردەم حەز لە سەربەخۆیی و ئازادی دەکەن، بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە؟

لەلایەکی ترەوە، کۆمیسیۆنێکی سەر بە چەندان وڵاتانی ئەوروپایی، پێویستە لە مەسەلەی گەڕاندنەوەی سامانی لەدەستچووی ئەرمەنییەکان بکۆڵێتەوە. ئەمە لە کاتیکدا ئەگەر ئەرمەنییەکان ئارەزووی ئەوە بکەن بەرەو ئەرمینیا کۆچ بکەن، هەروەها ئەگەر ئەو کۆمیسیۆنە ڕەزامەندیی کوردەکانیش وەربگرێت.

بەپێچەوانەی پرەنسیپەکانی ویڵسن، ئەمڕۆ هەموو شتێک دژی کوردەکان دەکەوێتەوە، واتە دژی ئەوەی کە ئەمڕۆ دەوڵەتێکی ئازاد و سەربەخۆی کورد دروست ببێ.

هەر چواردە بەندەکانی ویڵسن کە سەرتاپایان لەلایەن ڕێژیمیی عوسمانییەوە قبووڵ کراون، کوردەکان وا لێ دەکەن (ئەو بەندانە بە ڕاستی مافی ئەوەی پێ داون) کە بێن داوای سەربەخۆیی خۆیان بکەن. ئەمەش بەبێ هیچ پاداشتدانەوەیەکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی: ئەو ئیمپراتۆریەتە عوسمانییەی کە کوردەکان هەردەم بەدەم پاراستنی داوونەریتی خۆیانەوە، بەدرێژاییی چەندان سەدە لەژێر سایەیدا ژیاون.

ئەوەتا، ئێستا، ئەمەیە پوختەی داخوازییەکانی کوردەکان کە لەژێر رۆشناییی ئەو سەرنجانەی سەرەوەدا هەڵمان هێنجاون.

ئێمە بەتوندی ناڕەزاییی خۆمان دەردەبڕین لە هەمبەر داخوازییە دەستدرێژکارییەکانی ئەرمەنییەکان بۆ سەر خاکی کوردستان، ئەو کوردستانەی کە لە چوارچێوەی سنوورەکانی خۆیدان – وەک لەو نەخشەیەی پاشان پێشانی دەدەین – پێویستە تەنیا بۆ کوردەکان خۆیان بمێنێتەوە.

سەبارەت بەوەی کە سامانی نەتەوەییی کورد تەنیا بەخێوکردنی مەڕوماڵاتە و هەروەها ئاووهەوا ناچاریان دەکات کە بۆ دۆزینەوەی لەوەڕگا و پاوانەکانیان گەرمیان و کوێستان بکەن، ئێمە لە پێناو مسۆگەرکردنی ژیانی ئەم گەلە و پاراستنیان لەدەست نالەباری و چورتمی ئابووری، سوورین لەسەر داواکردنی خۆمان لەوەی کە ئەو پاوان و مێرگانە نەخرێنە دەرەوەی ئەو سنوورەی بۆ کوردستان دیاری دەکرێ.

لە کۆتاییدا ئێمە داوای سەربەخۆبوونی خۆمان دەکەین. ئەمەش مافێکی ڕەوای (قانوونی) خۆمانە، تەنیا ئەم سەربەخۆبوونەشە ڕێگەمان دەداتێ لە پێناو پێشکەوتن و گەیشتن بە شارستانیەتدا کۆشش بکەین، هەروەها بتوانین بەهرە لە سامانەکانی وڵاتەکەمان وەربگرین و لەگەڵ دراوسێکانماندا بە ئاشتی بژین.

وێڕای ئەمەش ئێمە ئاواتەخوازین کە کۆنفرانسی ئاشتی، کۆمیسیۆنێکی نێودەوڵەتی پێک بهێنێت. ئەو کۆمیسیۆنە ئەرکی ئەوە بێت سنوورەکانی کوردستان بەپێی پرەنسیپی نەتەوایەتییەکان بەشێوەیەک دیاری بکات کە سەرتاپای هەرێمە کوردنشینەکان بگرێتەوە: ئەو هەرێمانەی کە کورد ژمارەیان لە چاو ژمارەی میللەتانی تر زیاترە.

بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەگەر لەو هەرێمە دیاریکراوانەی دەدرێنە پاڵ کوردستان کۆمەڵە خەڵکێکی غەیرە کورد هەبن، ئەوا ئەو کۆمەڵە خەڵکە مامەڵەیەکی تایبەتی وایان لەگەڵ دەکرێت کە لەگەڵ داوونەریتی نەتەوایەتییان پێکەڵپێک بێنەوە.

ئێمە هیوایەکی زۆرمان بە دادپەروەرایەتیی ئەم کۆنگرەیە هەیە. ئیدی ژیان و داهاتووی گەلێکی دێرینی پێ دەسپێرین: ئەو گەلەی کە ئەگەر ڕێگەی پێ بدرێ باش دەزانێ چۆن ڕێگەی بووژاندنەوەی خۆی پەی بکات.

پاریس ٢٢ مارس ١٩٩٩

جەنەراڵ شەریف پاشا

سەرۆک وەفدی کوردان لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس

پەراوێز و سەرچاوە:

- ماوەیەک بوو لە وەرگێڕانی ئەم دۆکیومێنیتە بۆ کوردی بووبوومەوە، لە ناکاو چاوم بە کتێبەکەی د.بلەچ شێرکۆ کەوت (کێشەی کورد، مێژینەی و ئێستا) کە کاک حەمەی حەمەباقی لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی. لێرەدا لەبەر ئەوەنا کە ئەم تێکستە تەرجەمەکراوەی بەردەست لە سەرچاوە فرەنساییە ئەسڵییەکەوە کراوە، بگرە لەبەرئەوەی دوای بەراوردکردنێکی وردی نێوان هەردوو تێکستەکە (تەرجەمەکەی خۆم و تەرجەمەکەی کاک حەمەباقی) بۆم دەرکەوت کە وەرگێڕانە لە زمانی عەرەبیکراوەکەی حەمەباقی، لە گەلێک شوێندا شتی لەخۆڕای لێ زیاد کراوە، یانیش زۆرجاران لێی کەم کراوەتەوە و دەسکاری کراوە. ئەمە جگە لە هەڵە و پەڵەی ئامار و سەرژمێرییەکان، بە هەڵە نووسینەوەی ناوی جێگا و شار و هۆزە کوردەکان. هەر چۆنێک بێ، وەرگێڕانە لە زمانی عەرەبیکراوەکە هەم شێواز و هەم ناوەڕۆک و بیری یاداشتنامەکەیان شێواندووە.

ئێمە لە کاتێکدا دڵنیاین بنچینەی ئەم هەڵە و کەموکورتییانە دەگەڕێتەوە بۆ تەرجەمە عەرەبییەکە، هیواداریین ئەم وەرگێڕانەی بەردەست کە ڕاستەوخۆ لە فرەنساییەوە کراوە، هەم بۆ ڕووناکبیر و مێژوونووسانی کورد، هەم بۆ چاپی داهاتووی ئەو کتێبە سوودێک بگەیەنێ.

١/ ئێمە ئەم دۆکیومێنتەمان لەم سەرچاوەیەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی:

Memurandum sur les revandication deu Peuple Kurde, Impr. AGI. Hoir: 26, Rue de Deta, 26, Paris: 1919. 15 Pages.

٢/ شەریف پاشا لە نووسینەکەدا زاراوەی نایشن (نەتەوە)ی بەکار هێناوە بۆ کورد، نەک (گەل).

٣/ ناوەڕۆکی ئەم یاداشتنامەیە ئەوە پێشان دەدا کە جەنەراڵ شەریف پاشا شارەزاییەکی قوول و فراوانی لەبارەی مێژووی کۆنی نەتەوەکەی خۆیەوە هەبوو.

٤/ پێش ئەم یاداشتەی شەریف پاشا، ئەرمەنییەکان یاداشتێکیان بەناوی داخوازییە سیاسییە (نیشتمانییەکانی) ئەرمەنییەکان پێشکێش کردبوو. لەو یاداشتەی خۆیاندا بەشێکی زۆری خاکی کوردستانیان لەگەڵ (ئەرمینیا) دابوو.

٥/ئەم سەرچاوەیە کە شەریف پاشا پشتی پێ بەستووە ئەمەیە:

E. Reclus: Nouvelle Geographie Universelle, 9me Vol., Paris: 1894, 1879.

کۆد و ژمارەکەی لە کتێبخانەی لانگزۆ لە پاریس(ئێم ئێن٢ . ٤).

٦/ئەم پرەنسیپ و یاسایە، ویڵسن لە دوای کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی دایهێنا کە هەر نەتەوەیەک لە ڕۆهەڵاتی ناوەڕاستدا پێویستە دەوڵەتی خۆی هەبێ.

٧/بۆ سەرژمێریی کورد و ئەرمەن هەروەها جوگرافیای کوردستان و ئەرمینیا لە سەدەی نۆزدەمدا بڕوانە ئەم دوو سەرچاوەیە بە زمانی عوسمانی:

علی امیری دیاربکر الی: عسمانلی ولایات شرقیەسی. استانبول، اقبال کتابخانەسی، سالی چاپ(١). ١١٢ لاپەڕەیە، کۆدی لە کتێبخانەی لانگزۆ لە پاریس (٢٧) ٨ . ٦٥٩ میل.

سعادتلو سعید پاشا: سالنامە ولایت دیاربکر، قسم تانی استانبول (١٣٠٢ھ) (کۆد و ژمارەی لە

کتیبخانەی لانگزۆ لە پاریس:١١١ , ٦٣٥ تور.

٨/بڕوانە

Statitiqye de Van et de Betlis, Tr. de Russe en Fr. par M. Sadik Bay, Imp. Militaire, Constantinople: 1924.

ئەم کتێبە لە بنچینەدا بە رووسی نووسراوە لە کۆتاییی سەدەی نۆزدەمدا بە ناونیشانی سەرژمێری دانیشتوانی وان و بەتلیس. محەمەد سادق بەگ لە رووسییەوە کردوویە بە فرەنسی.

٩/ ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام دەڵێ کە شاری بەتلیس ناوجەرگە و مەڵبەندێکی هەرە سەرەکیی کوردستانە. بڕوانە وشەی بەتلیس لە سەرچاوەی ناوبراودا:

Encyclopedie de l Islam, T. 1., P. 733. Paris: 1913.

١٠/ بڕوانە پەراوێزی ژمارە (8).

## سەرچاوەکان


فرەنسی:

Encyclopedique Larousse, Libr. Larousse, Paris: 1979, P. 924.

L etat Majeur Russe: Statistiques de Van et Bitlis, tr. du russe par M. SADIK BEY, comandat de Cavalerie, Immpr. Militaire, Constantinople: 1914.

Sherif Pasha: Memorandum sur les revandications du peuple Kurde, Imprimerie A-G. L HOIR, Paris: 1919, P. 11.

Les Quqtre Evangiles en Kurde en Caracteres Armeniens. Constantinople: 1857. سێ دانە لەو کتێبە لە ئەرشیڤخانەکەدا هەیە. ئەمەش کۆدی کتێبەکەیە لە ئەرشیڤخانەی ناوبراودا: نوسخەی یەکەم: AB. VII. 52 ، نوسخەی دووم: QA. X. 252، نوسخەی سێیەم: BA. III. 23

Archang TCHOBANIAN: La nation armenienne et son oeuvre culturelle, Paris: 1945. P. 15.

A. TCHOBANIAN: La nation armenienne, Paris: 1945. P. 15.

H. VAHRAMIAN: Les dialectes de la langue armenienne, in CRDA, No 80, Janvier 1984, Paris. P. 23-27.

Abecedaire et abreger de l histoire d Armenie, Constantinople: 1861.

واتە ( ئەلفبای ئەرمەنی و کورتەیەک لەبارەی مێژووی ئەرمەنستان). ئەمەش کلیلەکەیەتی، لە هەمان کتێبخانەدا.

OP. VII. 8.

Henry BINDER: Au Kurdistan, Maison Quantin, paris: 1887.

Le cte DE CHOLET: Armenie, Kurdistan et Mesopotamie, Libr. Relation d un Voyage du Levant, Imp. Royale, Paris:1717.

Stanford SHAEW: Histoore de L Empire pttoman et la Turquie,Tome. 1. ed. Harvath paris: 1983

Addai SCHER: Histoire Nestorienne Chronique de Seert, Archeveque Chaledeen du Kurdistan, 1909.

CHODZKO: Etudes philologiques sur la langue Kurde - Dialecte de Suolemanie, in Journal Asiatique, No 4, Paris; 1857. 60 pages.
Mierlla GALLETTI: Curdi e Kurdistan in opere italiana del XIII-XIX, in Riv. ORIENTO MODERNO, Anno LVII, Nr. 11, Nov. 1978, P. 563-596.
Raphael J. Bidawid: Les ettres du Patriarche Nestorien Thimote 1, Cittadel Vatican 1956.
A. JABA: Resume de l ouvrage d Ahmed Effendi Khani, Tr. par A. JABA, in Bulletin Hist. Philologique, LXV, 1858, No 11, P. 161-171.
Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860
Pierre RONDOT: Publication Kurde en caracteres latins Hawar, Revue Kurde in Bulletin d Etudes Orientals de l Institut Francais de Damas, T2, 1933, P. 3.
Roger LESCOT: Litterature Kurde, PP. 795-805, in Encyclopedie de la Pleade, Histoire des Litteratures, Vol. 1, ed. Gallimard, Paris: 1977, P. 903.
Emir Kamuran BEDE-RKHAN: Le Roi Du Kurdistan, Roman Epique traduit du Kurde Par Emir Kamuran BEDE-RKHAN et Adolphe de FALGAIROLLE, ed. OPHRYSGAP. Paris: 193?, 84 pages.
Thoas BOIS: Connaissance des Kurdes, Khayat, Beyrouth: 1965, P. 133.
Basile NILITINE Les Lurdes Ed . D. Aujourd hui Paris: 1956. p. 23.
C.Le STRANGE: The Lands of the Esterm caliphate Cambridge at the Uni versty Press. 1950 p. 192.
La. Turquie Col Lection Monde et Voyages Edition Larousse. Paris: 1974 pp. 20 -21.
Basile NILITINE Les Lurdes Ed . D. Aujourd hui Paris: 1956. p. 23.- 24
V. MINORSKY. "Kurdes.pp. 1196- 1222"in (Encyclopedie de L Islam) dictionnire Geographdique Rthog. et. Biog. des peuples Musulmand. Tome 2. E.L.A PICARD editeut. Pares 1927. p. 1220.
C.Le STRANGE: The Lands of the Esterm caliphate Cambridge at the Uni versty Press. 1950 p. 5
A.SPIEGEL Eranisch Alertuni Col. Kartsew.B- Chevalier CHARDIN: Voyages du ch CHARDIN EN Perse 4 vol Amsrtsame: 1735,reedite a paris (1811)
Notices et Extraits des MANUSCRITS de la Bibliotheque du Roi Publied Paar Linstitut Royal de France Tome 13e Imp Royal Paris 1838 p. 305
G, Le STRANGE Mesopotamie and Persea Under the Mangol,London: 1903 . pp ,5 27, 52, 57,
DRIVER DISPERSION of rhe kurds in ansient times in (Joumal of the Royal Asiats Society) october 1921 pp 563 572.
Gerard CHALIAND. Atlas de la decouverte du monde, ed Fayard. Paris 1983, pp. 62.
ROBERT OSLON: THE EMERGENCE OF KURDISH NATIONALISM (1880-1925) U.OF TEXAS PRESS, USA: 1989 P 15
REVUE DU MONDE MUSULMAN V.X , PARIS: 1910, N, IV P 578.
BULLETIN ARMENIEN, N 18-19-20, P. 4 , PARIS: MARS 1920
The Cambridge history of Iran.V.2. The Medien and Achamenian Period, ed. by ILya GESCHVITCH, Cambridge university Presse, London_ Newyork_ Sydney: 1968?,P354, 365_359.

tome ll, Livre lV- Vll, Texte etabli et traduitr psar Paul Masqueray, ed. Societe d.:Xenophon: Anabase edition (Les Belles Lettres), Paris :1967.p.18.

Herkol Azizan: kardox. le govari Hawar, jimre 32,L.4-7,Dimasiq: 1941.

Xenophon: Anabase. T.ll.p.175-185:(Notes com plementaires) page N 7.

V.MINORSKY:(kurdes) in Encyclopedie de Islam, T. ll, E-K, Paris: 1927.pp.1197-1196.

Hinna Fiee: Jalons pour une histoire de l Eglise en Iraq in >> Scriptorum Christianorum Orientalium, Lovan: Lovan: 1970, P. 110-112.

J. M. MERIGOUX: Un precurseur de dialogue islam-chretian: Frere Ricoldo, R. Th., 4, Paris: 1974.

E. B. SOEN: A short Anthology of Guran Poetry, in Journal of the Royal Asiatic Society, Pt 1, 1921,

T. BOIS: Coup d oeil sur la litterature kurde, Al `` machriq, Mars 1955, P. 206. تۆما بوا . P. 57-81.

Voyage d Ibn Battita, ed. et tr. francaise: C. Defremery et B. R. SAnguinetti, Paris, Vol. II, P. 134- ) 138, 141-142.

Raphael J. Bidawid: Les ettres du Patriarche Nestorien Thimote 1, Cittadel Vatican 1956.

Less Six Voyages en Turquie et en Perse l er edition, Amstrdam chez johannes Van Someren, 1678.

فارسی:

– علی اکبر فیاض: گزنفن در بازگشت، مجلهء (یغما)، شماره (٥)، ص ٤٤٣–٤٩٣، طهران:؟١٩٥٩.

هاشم رضی، تاریخ مطالعات دینهای ایرانی، چاپ دوم، ١٣٧١ش، چاپخانەی خواجه، انتشارات بهجت، تهران. ص٩٢– ,٩٣

– حبیب الله صمدی: کردستان در چهل هزار سال پیش، مجلهء (بغستان) جلد اول. شمارهء اول، ص ٣٨–٣٩. طهران: ١٩٦٣.

– حبیب الله تابانی: هاونەتەوەیی قەومی کورد و ماد، و: جەلیل گادانی، سلێمانی: ٢٠٠٨

کوردی:

– فارس عوسمان: کورد و ئەرمەن، پێوەندییە مێژووییەکان، وەرگێڕانی خالید هەرکی، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبیی نما، زنجیرەی ( ٨١)، چاپی یەکەم/ هەولێر: ٢٠١٠.

– د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل ١٢٥ ـ ١٢٩؛ هەروەها بڕوانە " چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد"، بەشی یەکەم، د. ر. ب. ک.، بەغدا: ١٩٨٥، ل ٣٠ ـ ٣١.

– محەمەدی مەلا کەریم، هەنگاوێکی تر بەرێگەدا بەرەو ساغکردنەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی، بەغدا، ١٩٨٩، چاپخانەی (دار الحریة).

– بێرنارد لویس: بەریەککەوتنی کولتوورەکان، و: یاسین حاجی زادە، دەزگای موکریانی، هەولێر: ٢٠٠٨

– ئەرشاک سافراستیان: کوردستان و کوردەکان، وەرگێڕانی : خالید هەرکی، چاپی یەکەم، هەولێر: ٢٠١٠، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبیی نما، زنجیرەی (٩٣).

– د. نەجاتی عەبدوڵڵا: بیبلیۆگرافیای کوردناسی، بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر: ٢٠٠٩

– د. فەرهاد پیربال: ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، چاپ و بڵاوکردنەوەی «مەڵبەندی بڵاوکردنەوەی

ئاشتی»، دهۆک: ۱۹۹۹، ل ٢٤–٢٥.
– کورد لە کەیەکەوە خەریکە، و: لە تورکییەوە: عەلی عیرفان، بەغدا: ۱۹۲۷، ل ۲۷
– جەلیلی جەلیل: هەندێ سیمای ژیانی کۆمەلآیەتی و سیاسی و کولتووریی کورد لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆردەم، و: ئەنوەر قادر محەمەد، ستۆکهۆلم: ۱۹۹۳.
– ئەکرەمی مەحموودی سالحە رەشە: شاری سلێمانی، بەرگی دووەم، بەغدا: ۱۹۸۹.
– جەمال نەبەز: زمانی یەککرتووی کوردی، بلاوکراوەکانی یەکەتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا، بامبێرگ (ئەلمانیای رۆئاوا): ۱۹۷٦، ل ۷۸ ــ ۸۷.
– کەمال مەزهەر: چمکێک لەبارەی یەکەم چاپخانەی کوردی لە شاری سلێمانی، کتێبی (چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد). بەشی یەکەم، د.ر. ب. ک. بەغدا: ۱۹۸۵، ل ۱٥۳.
– کەمال ڕئووف محەمەد: ئەدەبی نامەنووسینی کوردی، ۳ بەرگ، دەزگای ئاراس، هەولێر: ۲۰۰٤
– محەمەد بایراقدار: ئیدریسی بدلیسی، شکور مستەفا کردوویە بە کوردی، ئاراس، هەولێر: ۲۰۰۹.
– مشیحا زیخا: کرۆنۆلۆجیای ئەربێللا، کوردناسی ئەلمانی، ئێدوارد زاخاو Edward Sachau لە سالی ۱۹۱٥ لە بەرلینی رۆئاوا تەرجەمەی ئەلمانیی کردووە و چاپی کردووە، و: لە ئەلمانییەوە: عەبدولمؤئمین دەشتی، بنکەی چاپەمەنیی سەکۆ، بەرلین: ۱۹۹٥.
– عەبدوللا بابەکر حەمەد ئاغا: رۆژنامە و ڕێکخراوە کوردییەکانی تورکیا، لە تورکییەوە ئامادەی کردووە، کاروان، ژمارە ٦٤، ۱۹۸۸
– د. کەمال مەزهەر: ماتێنەدەران، بەیان، ژ ۳۰، بەغدا: ۱۹۷٥، ل ۷ــ ۱۰.
– د. جەمال رەشید: لێکۆلینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی مێژووی ولآتی کوردەواری، لە بلاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی بەغدا. ۱۹۹۸
– فەیسەل دەباغ: یەکەم کۆمەلەی کوردی، رۆژنامەی برایەتی، ژ (۲۹٤٦) رۆژی ۱۳–۱۰– ۱۹۹۹، ل ۲.
– د. جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی، بنکەی ئازاد، ستۆکهۆلم: ۱۹۸٥
– فیلیپ کرینبۆرک: کولتوور و ناسنامەی کورد، و: وریا ڕەحمانی، موکریانی، هەولێر: ۲۰۰۸.

عەرەبی:
– الدكتور كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة محمد الملا عبدالكريم، بغداد، ۱۹۷۷، مطبعة المجمع العلمي الكردي، الطبعة الاولى.
– د. أ. استارچیان: تأريخ الامة الارمنية چاپی مووسل، ۱۹٥۱.
– اسامە نقشبندی و جميل روفائيل: مخطوطه ارادن، مجلة بين النهرين، عدد: ۱۳، الموصل: ۱۹۷٦، ص٦۹ ــ ۷۳.
– محمدامين زكي بگ: خلاصة تأريخ الكرد و كردستان، ج (۱) و (۲)، ترجمة من العربية الي الكردية (محمد علي عوني).
– د. يوسف حبي: كنيسة المشرق، كۆواری بين النهرين، ژمارە ۱٤ ــ ۱٥، مووسل: سالی ۱۹۷٦، لاپەڕە ۱۹ ــ ۲۹.

– وليەم دو ڤريز: نشاه بطريركية كرسى المشرق، تعريب: الاب د. سرهد جمو، بين النهرين، عدد: ٩ ــ ١٠، موصل: ١٩٧٥، ص ١٠.
– الاب لويس ساكو: البطريرک طيمثاوس الكبير، كۆوارى بين النهرين، ژماره ١٤ ــ ١٥، مووسڵ: ساڵى ١٩٧٦، لاپەڕە ٢٣٤ ــ ٢٣٧.
– ادوين بڤن: ارض النهرين، ت: انستاس الكرملى، بغداد: ١٩٦١، ص ٤٢.
– پ. پيتەر P. Peeter: شەهيدەكانى ئەربێلا، لە (هەڵبژێردراوە پۆڵەندييەكان)، ژ (٤٣)، پاريس: ١٩٢٥، بە فرەنسى.
– ف. زوريل: تأريخ كنيسة أربيل، في مجموعة الشرقيات المسيحية، عدد ٣١، مجلد ٤ و ٨، روما: ١٩٣١. لەم سەرچاوەيەدا باس كراوە:
– جان فييەک تأريخ أربيل، مجلة الشرق السرياني، عدد ١٢، ١٩٦٧، ص٢٦٥ – ٣٠٢، بە عەرەبى.
– دبليو. آر. هي: سنتان في كردستان ١٨–١٩٢٠، ترجمة: فؤاد جميل، الجزء الاول والثاني، مطبعة الزهراء، بغداد: ١٩٧٣.
– توفيق وهبى: الاثار الكاملة، الجزء الاول، منشورات (بنكەى ژين)، مطبعة شظان، السليمانية ٢٠٠٦، ص ٥٧
– زنار صلوبى: فى سبيل كردستان، ت: د. رظوان على، دارالكاتب، بيروت: ١٩٨٧، ص ٢٢.
– د. جليلي جليل: نهضة الأكراد الثقافية، ت: ولاتو، دمشق: ؟. هەروەها د. عبدالستار طاهر شريف: تاريخ الاحزاب والمنظمات الكوردية ١٩٠٨–١٩٥٨، شركة المعرفة. بغداد: ١٩٨٩.
– د. وليد حمدي: الكرد في الوثائق البريطانية، لندن: ١٩٩١.
– د. فرهاد پيربال: دراسات حول تاريخ الكورد، ت: ترزه جاف، دار كاوا، بيروت: ١٩٩٩
– ميريللا غاليتى: التراث الكردى فى مؤلفات الايطاليين، ت: د. يوسف حبى، كۆوارى كۆڕى زانيارى عێراق، دەستەى كورد، بەرگى هەشتەم، بەغدا: ١٩٨١، ل ٢٢٥ــ ٣٠٠.
– د، يوسف حبى: كنيسه المشرق، كۆوارى بين النهرين، ژماره ١٤ ــ ١٥، مووسڵ: ساڵى ١٩٧٦، ص ١٩ ــ ٢٩.
– وليەم دو ڤريز: نشاة بطريركية كرسي المشرق، تعريب: الاب د. سرهد جمو، بين النهرين، عدد: ٩ ــ ١٠، موصل
– حنا عبدالاحد رؤوف: شعراء مسيحيون في اربيل في القرن الثالث عشر الميلادي، زاگروس، عدد ٢، اربيل: ١٩٩٧.
– سهيل قاشا: الموصل في مذكرات الرحاليين الاجانب، بين النهرين، عدد ٥، موصل: ١٩٧٧
– د. حكيم احمد خوشناو: الكورد وبلادهم عند البلدانيين و الرحالة المسلمين (٨٤٦– ١٢٢٩)، دار الزمان، دمشق: ٢٠٠٩
ــ م. سترك: دائرة المعارف الاسلامية، مادة اربل، طبعة مصر: ١٩٣٣، ص ٥٧٤.
– احمد بن يوسف الارزق الفارقي: تاريخ الفارقي، تحقيق و تقديم: د. بدوي عوض، القاهرة: ١٩٥٩